# سایکۆلۆجیای ئایینداری

## د. ئازاد عەلی ئیسماعیل





لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٤١)

سایکۆلۆجیای ئایینداری
د. ئازاد عەلی ئیسماعیل

بە شێوەیەکی گشتی لە ماوەی ٣٠ ساڵی ڕابردوودا، گۆڕانێکی زۆر لە بواری سایکۆلۆجیا هاتۆتە ئاراوە. بابەتی ئایین و ڕۆحانیەت چیتر وەك بابەتێکی لاوەکی لە بواری سایکۆلۆجیا دانانرێن و وەك شتێکی تابوو (شتێکی قەدەغەکراو) مامەڵەیان لەگەڵدا ناکرێت، لە ڕاستیدا توێژینەوەیەکی گەلێك زۆر لە بواری سایکۆلۆجیای ئایین وڕۆحانیەت ئەنجامدراوە، بە شێوەیەك کە هەندێ لە پسپۆڕە ناودارەکان لەم بوارەدا پێیانوایە ئایین و ڕۆحانیەت دەبنە یەکێك لەو پێنج هێزانەی سایکۆلۆجیای هاوچەرخ.



### ژیاننامە

- ئازاد عەلی ئیسماعیل
- لەدایکبوی: ١٩٦٧
- قۆناغی خوێندنی سەرەتایی و ئامادەیی لە هەولێر خوێندووە.
- بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی لە دەروونزانی کولێجی ئەدەبیاتی، زانکۆی بەغدا ١٩٨٩ تەواو کردووە.
- بڕوانامەی ماستەری لە پەروەردە (ڕێنمایی)، زانکۆی جیهانی ئیسلامی مالیزی ١٩٩٧ تەواو کردووە.
- بڕوانامەی دکتۆرای لە دەروونزانی (دەروونساغی)، زانکۆی نیشتیمانی مالیزی ٢٠٠٤ تەواو کردووە.
- پلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەری لە ٢٠٠٩ وەرگرتووە.
- سێ کتێبی بڵاوکراوەی هەیە و کۆمەڵێك وتاری زانستی لە گۆڤارە زانستییەکانی ناوەوە و دەرەوەی هەرێم بڵاوکردۆتەوە بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی.
- مامۆستایە لە زانکۆی کۆیە.

rawsht

# سایکۆلۆجیای ئایینداری

.......................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٤١)

• نووسینی: د. ئازاد عەلی ئیسماعیل
• بابەت: دەرونزانیی
• دیزاین: رەوشت محەمەد
• چاپی یەکەم: چاپخانەی شڤان

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٦١٠)ی ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە

# پێڕست

**بەشی چوارەم: ئایینداری لە قۆناغەکانی تەمەندا**



**بەشی پێنجەم: پەیوەندی نێوان ئایینداری و دەروونساغی**



**بەشی شەشەم: دەرەنجام**

# پێشەکی

ئایین یەکێکە لەو بابەتانەی بەردەوام قسەی لەسەر دەکرێت، هەم لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و هەم لەلایەن خەڵکانی ناپسپۆڕەوە، چونکە ئایین لەهەمانکاتدا کە بابەتێکی گشتیە، گەورە و بچووك، ژن و پیاو، خوێندەوار و نەخوێندەوار، هەژار و دەوڵەمەند، بە شێوەی جیاجیا قسەی لەسەر دەکەن، لەهەمانکاتیشدا بابەتێکی تایبەتیە و کەسانی پسپۆڕیش لە بواری جیاجیادا قسەی زانستیی لەسەر دەکەن، ئەو کەسە پسپۆڕانە هەندێکیان زانایانی ئایینین، هەندێکی دیکەیان پسپۆڕانی کۆمەڵناسیی، پسپۆڕانی فیکر و فەلسەفە و پسپۆڕانی سیاسەت و پسپۆڕانی دەروونیین.

چۆن خەڵکی گشتی، بە شێوەی جیاواز قسە لەسەر ئایین دەکەن، کەسانی پسپۆڕیش جیاوازییەکی زۆریان هەیە لە چۆنیەتی قسەکردنیان لەسەر ئایین، هەندێکیان گرنگی بە سەلماندنی نێوەڕۆکی ئایینێکی دیارییکراو دەدەن، کە ئەمانە زانایانی ئەو ئایینەن، پسپۆڕانی کۆمەڵناسیی زیاتر جەخت لەسەر ڕۆڵی کۆمەڵایەتی ئایین دەکەن، پسپۆڕانی مرۆڤناسییش گرنگی زیاتر بە چۆنێتی دروستبوونی ئایین و

شێوەکانی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان دەدەن، پسپۆڕانی دەروونییش گرنگی بە ڕۆڵی دەروونیی ئایین لەسەر تاکەکان دەدەن.

سەبارەت بە گۆڕانی ڕۆڵی ئایین لە بواری سایکۆلۆجیادا، ئیتن و هاوڕێکانی (Aten, OGardy & Worthington, 2012: 2) دەڵێن: "بە شێوەیەکی گشتی لە ماوەی ٣٠ ساڵی ڕابردوودا، گۆڕانێکی زۆر لە بواری سایکۆلۆجیا هاتۆتە ئاراوە. بابەتی ئایین و ڕۆحانیەت چیتر وەك بابەتێکی لاوەکی لە بواری سایکۆلۆجیا دانانرێن و وەك شتێکی تابوو (شتێکی قەدەغەکراو) مامەڵەیان لەگەڵدا ناکرێت، لە ڕاستیدا توێژینەوەیەکی گەلێك زۆر لە بواری سایکۆلۆجیای ئایین وڕۆحانیەت ئەنجامدراوە، بە شێوەیەك کە هەندێ لە پسپۆڕە ناودارەکان لەم بوارەدا پێیانوایە ئایین و ڕۆحانیەت دەبنە یەکێك لەو پێنج هێزانەی سایکۆلۆجیای هاوچەرخ".

جۆهانسن (Johansen, 2010) ئاماژە بەوە دەکات کە لە ماوەی شەست ساڵ (لە ساڵی ١٩٠٠ تا ساڵی ١٩٥٩) دا ٣٨٠٣ وتار (article) دەربارەی ئایین و ڕۆحانیەت لە ئەدەبیاتە سایکۆلۆجیەکان نووسراوە، بەڵام لە ماوەی تەنها شەش ساڵدا (لە ساڵی ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٦) کۆی ٨١٩٣ لەم جۆرە وتارانە بڵاوکراونەتەوە، ئەمە ئاماژە بە زیاد بایەخدان بە بابەتی ئایین و ڕۆحانیەت لە بازنە زانستییە دەروونییەکان لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و بە تایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەکات.

لە توێژینەوەیەك کە لەسەر ئەندامانی یەکێتی دەروونزانانی ئەمەریکی (APA) لە لایەن دیلانێی و میلەر و بیسۆنۆ (Delaney,

ئەنجامدرا، بەدیار کەوت: ٨٢٪ لەو (Miller & Bisono, 2007 سامپڵەی کە وەڵامی ڕاپرسییەکەیان دابۆوە، لەو بڕوایەدابوون کە ئایین سوودبەخشە، تەنها ٧٪ لە سامپڵەکە بڕوایان وابوو ئایین بۆ دەروونی مرۆڤ زیانبەخشە.

لای ئێمە بە دەگمەن پسپۆڕانی دەروونزانی قسە لەسەر ئایین دەکەن، زۆرجاریش کە قسەی لەسەر دەکەن، خۆزگە دەخۆی کە قسەیان نەکردبایە! نەك لەبەر ئەوەی قسەکان دژی، یان دۆستی ئایینن، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە لە ڕووی ئاسۆییەوە قسەکان لە بوارێکی هەژارو تەسکدا دەکرێن و لە ڕووی ستوونیشەوە شیکردنەوەی قووڵی تێدا نییە.

لە زانکۆکانی کوردستانی عێراق و لە عیراقیشدا، سایکۆلۆجیای ئایین وەك بابەتێك لە بەشەکانی دەروونزانی ناخوێندرێت، بۆیە ئەگەر پسپۆڕی دەروونی هیچ زانیاریەکی لەسەر بابەتەکە هەبێت، ئەوا بەرهەمی خوێندنەوەی خۆیەتی، هەرچەندە لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، سایکۆلۆجیای ئایین پسپۆڕییەکی دیارییکراوە کە بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرای لەسەر وەردەگیرێت، بەڵام لە بەشەکانی دەروونزانی لە زانکۆکانی هەرێم لەسەر ئاستی ئەکادیمییەوە هیچ گرنگییەك بەم بابەتە نادرێت.

**ئازاد عەلی ئیسماعیل**

**٢٠١٦**

# بۆچی دەبێت لە ڕوانگەی
# سایکۆلۆجیەوە لە ئایین بکۆڵینەوە؟

هود و هاوڕێکانی (Hood, Hill & Spilka, 2009:1) لەو بڕوایەدان وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر سادە وساکارە: چونکە لای زۆرێك لە خەڵك ئایین زۆر گرنگە و چەندەها ڕەفتاری سەرنجڕاکێش بە ناوی ئایینەوە دەکرێت و ئایین بۆتە بەشێکی دانەبڕاو لە چەندەها لایەنی بوونی ئادەمیزادەکان، بەڵکو هەندێ لە توێژەران لە بواری ئاییناسی (فراس السواح، ٢٠٠٢: لاپەڕە: ١٩) پێیانوایە باشترین پێناسە بۆ مرۆڤ ئەوەیە کە "بوونەوەرێکی ئاییندارە".

د. هیوستن سمیپ، لە کتێبێکی بە ناونیشانی " Why Religion Matters" واتە: بۆچی ئایین گرنگە؟ وەرگێڕانە عەرەبییەکەی بە ناونیشانی: (لماذا الدين ضرورة حتمية؟)، لە پێنج خاڵی سەرەکییدا بەراوردێك لە نێوان تێڕوانینی تەقلیدی (ئایینی) و تێڕوانینی زانستی بۆ جیهان دەکات (لاپەڕە:٤٨–٥٢ لە دەقە عەرەبییەکەی.

یەکەم: لە تێروانینی تەقلیدی ئایینیدا ڕۆح بنەمایە، نەك ماددە، لە کاتێکدا لە تێڕوانینی زانستییدا مەسەلەکە پێچەوانەیە.

دووەم: بە پێی تێروانینی تەقلیدی، ئایینی مرۆڤ لە شتێکی مەزنەوە هاتووە، لە کاتێکدا تێڕوانینی زانستی پێیوایە مرۆڤ لە شتێکی زۆر بچووکەوە هاتووە و پاشان گەشەی کردووە.

سێیەم: تێڕوانینە ئایینیەکان مزگێنی داهاتوویەکی خۆش دەدەن، لە کاتێکدا تێڕوانیی زانستی ئەم جۆرە مزگێنیە نادات.

چوارەم: لە تێڕوانیی تەقلییدیدا، جیهان بۆ مەبەستێك دروستکراوە لەلایەن خاوەن دەسەلاتێکی ڕەها، بەلام ئەم جۆرە مانا و مەبەستە لە تێڕوانینی زانستی بۆ جیهاندا نییە.

پێنجەم: خەلك لە جیهانبینی تەقلیدیدا هەست دەکەن کە لە مالی خۆیانن، سەر بەو جیهانەن، چونکە یەك خولقێنەریان هەیە، بەلام ئەم جۆرە ئینتیمایە بۆ جیهان لە تێڕوانینی زانستیدا نادۆزینەوە، ئینجا ئەگەر گریمان گشت زاناکان کەسانێکی دژ بە ئایین بن، یان بەلای کەمەوە ئایینیان لا گرنگ نەبێت، کە لە ڕاستییدا وانییە، بەلام زۆرینەی ئەو کەسانەی کە زانا نین و مرۆڤی ئاسایین بڕوایان بەو تێڕوانیینە تەقلیدییە هەیە کە (سمیس) لە سەرەوە ئاماژەی پێدا.

سادەترین پێناسەی سایکۆلۆجیا بەم شێوەیەیە: ئەو زانستەیە دیراسەی رەفتار و کردە عەقلّییەکانی مرۆڤ دەکات. لای زۆربەی خەلك، بەشێك لە رەفتاریان ئەنجامی بیروباوەڕی ئایینیانە، واتە بۆ هەندێ، ئایین هەم کاریگەری لەسەر عەقلّ و بیرکردنەوەیان هەیە، هەم لەسەر رەفتار و هەلّسوکەوتیشیان، بۆیە ناکرێت سایکۆلۆجیا خۆی لە قەرەی ئەم جۆرە رەفتار و بیروباوەڕانە نەدات کە پەیوەندییان بە ئایینەوە هەیە.

شتێکی زانراوە کە زۆرینەی کورد سەر بە ئایینی ئیسلامە، ئەم ئایینەش، وەك مارتن ڤان برونسن (Bruinessen, 1999) ئاماژەی

پێدەکات، بە شێوەیەکی قووڵ کاریگەری لەسەر کۆمەڵگای کوردی کردووە، بە شێوەیەك تەنانەت ئەو لایەنە کۆمەڵایەتی و سیاسییانەی کە ئایینیش نین، ئایین کاریگەری بە سەریانەوە هەیە، لە توێژینەوەیەکیشمان لەسەر خەسڵەتە سەرەکییەکانی کەسایەتی کورد (ئازاد علی اسماعیل و میران محمد صالح، ٢٠١٤)، بەدیارکەوت کە زۆرینەی مامۆستایانی زانکۆ پێیانوایە ئایین و ئاییندارى خەسڵەتێکی سەرەکی کەسایەتی کوردین.

ئێمەی کورد، لە کاتی نووسینی ئەم کتێبەدا، ڕووبەڕووی جەنگێکی ترسناك دەبینەوە کە بە ناوی ئایین و لەژێر دروشمی ئایینەوە هەڵگیرساوە و کاریگەرییەکی نێگەتیڤانەی لای هەندێ کەس تا ڕاددەی گومانکردن لە ئایینەکان بە گشتی و ئایینی ئیسلامیش بە تایبەتی، دروستکردووە. لەم جۆرە بارودۆخەدا خوێندنەوەیەکی زانستییانە بۆ دیاردەی ئاییندارى دەبێتە پێداویستیەکی، نەك تەنها زانستی، بەڵکو کۆمەڵایەتی و نەتەوەییش، ئەم کتێبە، کە هەوڵ دراوە بە شێوازێکی زانستی بنووسرێت، لەم ئاڕاستەیەدایە و نووسەر هیواخوازە سوودێك بە خوێنەر بگەیەنێت و کەلێنێکی بچووك لە کتێبخانەی کوردی ــ کە لە بواری سایکۆلۆجیادا زۆر هەژارە ـ پڕبکاتەوە.

**گرنگە هەر کتێبێك لە سەرەتادا زاراوە گرنگ و سەرەکییەکان پێناسە بکات، بۆ ئەوەی خوێنەر باشتر لە ناوەڕۆکی کتێبەکە و بیرۆکەکانی تێبگات. سێ زاراوە گرنگن کە ڕوونیان بکەینەوە، ئەوانیش زاراوەکانی (ئایین، ئاییننداری، سایکۆلۆجیای ئایین)ن، لە خوارەوە هەوڵ دەدەین بە کورتی هەندێ ڕۆشنایی بخەینە سەر ئەم زاراوە گرنگانە.**

## ئایین

به گشتی پێناسە ئایین، جێگەی مشتومڕێکی دوور و درێژە، هەم لە نێوان ئەو زانا و توێژەرانەی لە ناوەوەی بازنەی زانستە ئایینیەکان کار دەکەن، هەمیش لە نێو ئەو زانا و توێژەرانەی لە دەرەوەی ئەم بازنەیەدا کار دەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە تایبەتە بە سایکۆلۆجیاوە، هەوڵ دەدەین تەنها لە روانگەی پسپۆڕانی سایکۆلۆجییەوە ڕۆشنایی بخەینە سەر پێناسەی ئایین.

پسپۆڕانی سایکۆلۆجیش دوو هەڵوێستیان سەبارەت بە پێناسەکردن، یان پێناسەنەکردنی ئایین، هەیە. هەندێکیان، وەك لە خوارەوە ئاماژەی پێدەکەم، پێیانوایە دەشێ ئایین پێناسە بکرێت، بەڵام هەندێکی دیکەیان پێیانوایە کە پێناسەکردنی ئایین کارێکی زۆر زەحمەتە، بۆیە هەوڵی ئەوە نادەن پێناسەیەکی دیارییکراو بۆ ئایین

پێشکەش بە خوێنەر بکەن. ولیەم جێیمس لە کتێبە بەناوبانگەکەی (The variety  of religious experience) لاپەڕە ٣٦ بەم جۆرە پێناسەی ئایین دەکات:

"ئایین مانای ئەو هەست و کردار و ئەزموونانەی تاك تاکی مرۆڤەکان دەگەیەنێت لە تەنیاییاندا کاتێك وا تەماشای خۆیان دەکەن کە پەیوەندییان هەیە بە هەر شتێك کە بە لایانەوە ئاسمانی (یان خودایی) بێت". لە لاپەڕە ٤١ لە هەمان کتێب مانای "ئاسمانی یان خودایی بە زمانی ئینگلیزی divine بەم شێوەیە ڕووندەکاتەوە: "ئاسمانیی، یان خودایی، لای ئێمە تەنها مانای واقیعێکی سەرەتاییە کە وا لە تاك دەکات هەست بکات ناچارە بە ڕێز و جدییەتەوە، نەك بە نەفرەت و گاڵتەوە، وەڵامی بداتەوە".

جەیمس لیوبا (Leuba, 1909)، کە شاگردی ولیەم جێیمس بوو و یەکێکیشە لەو دەروونزانانەی کە هەر زوو گرنگییان بە بابەتی ئایینی دا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەو پێشنیازی ئەم پێناسەی خوارەوە بۆ ئایین دەکات:

"ئایین بریتییە لە بڕوا بوون بە هێزێکی مەزن و باڵادەستی نامادی، یان psychic چ لەسەر ئاستی کەسی بێت، یان نا، لە پەیوەندییەکی داینمایکی، چ فەرمی و ڕێکخراو بێت، یان نا، لە نێوان مرۆڤ و ئەو هێزە باڵایە کە مەبەستی مانەوە و زیادبوون و بەپیرۆزکردنی ژیانە". (لاپەڕە: ٩٢-٩٣)

میتکۆ و نایت (Mytko & Knight, 1999: 439) پێیانوایە زاراوەی (ئایینی) "زۆرجار بە پایەندبوونی کەسێك بە باوەڕ و بەها و کردارەکانەوە دەبەسترێتەوە کە دامەزراوەیەکی ڕێکخراو بە مەبەستی گەڕان بە دوای (شتە ئاسمانییەکان) بە هۆی چەند ڕێگایەکی دیارییکراو بۆ تێڕوانینی ژیان و گوزەرا، پێشکەشی دەکات".

لۆونپال (Loewenthal, 2006: 6) بەم شێوەیە پێناسەی ئایین دەکات: "ئایینیە تەقلیدیە سەرەکییەکان چەند خاسیەتێکی هاوبەشیان سەبارەت بە باوەڕ هەیە کە بریتین لە:

- بڕواهێنان بە بوونی واقیعێکی نامادی (واتە ڕۆحی)
- مەبەستی ژیان زیادکردنی ئاشتی و ئارامییە لە جیهان لە ڕێگای چاکەکردن و دوورکەوتنەوە لە خراپە
- ئایینە یەکخواییەکان بڕوایان وایە کە سەرچاوەی بوون، کە خودایە، هەر ئەویش سەرچاوەی ڕێنماییە ئەخلاقییەکانیشە
- هەموو ئایینەکان بۆ گەیاندنی بیرۆکەکانیان پشت بە ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی دەبەستن".

کێرکپاتریك (Kirkpatick, 2005:15)کە یەکێکە لە توێژەرە بەناوبانگەکان لە بواری دەروونزانی ئایینی، کاتێك دەگاتە پێناسەکردنی ئایین، دەنووسێت: "من مەبەستم لە ئایین... لە ڕاستیدا لێرەدا من پێت ناڵێم مەبەستم لە ئایین چییە، ئەوەش نەك لەبەر ئەوەی کە من نازانم چۆن پێناسەی بکەم (هەرچەندە ئەمە ڕاستە و من نازانم پێناسەی بکەم) یان لەبەر ئەوەی من جۆرێك لە پێناسەیەکی سەیر و

تایبەتم شاردبێتەوە و لە دواییدا بە ڕووتیدا بیتەقێنمەوە، دڵنیات دەکەمەوە کە بە شێوەیەکی گشتی مانای (ئایین) لام تا ڕاددەیەکی زۆر هەمان ئەو مانایایە کە زۆربەی خەڵك دەربارەی ئەو زاراوەیە هەیانە، بەڵام من نامەوێ هەوڵی پێناسەکردنی بکەم".

نێلسن (Nelson, 2009) لەو کتێبەی کە زیاتر لە ٧٠٠ لاپەڕەیە، پێناسەیەکی دیارییکراو بۆ ئایین ناخاتەڕوو.، بەڵکو لە دوو ڕەهەندەوە تەماشای ئایین دەکات: ئایین وەك پەیوەندییکردن بە خودا و ئایین وەك ڕێبازی ژیان، هەرچەندە بە درێژیی باسی ئەم دوو ڕەهەندە دەکات، بەڵام لە کۆتاییدا پێناسەیەك ناداتە دەست خوێنەر.

هود و هاوڕێکانیشی (Hood et al. 2009) بە هەمان شێوە خۆیان دەپارێزن لە پێشکەشکردنی پێناسەیەکی دیارییکراو بۆ ئایین بە گشتی و پێیانوایە لە حاڵی حازردا تەنها دەتوانن کە باس لە خاسیەتەکانی ئایین بکەن و لەسەر ئەم بنەمایە قسە لەسەر سایکۆلۆجیای ئایین بکەن، هەرچەندە ئاماژەش بەوە دەکەن کە دەکرێ پێناسەی جۆرێك لە ئایینەکان بکرێت، بۆ نموونە ئایینەکانی مەسیحیەت و ئیسلام.

لەبەر ئەوەی ئایینەکان ئەوەندە جۆراوجۆرن و هەندێکجار زۆر لەیەکتر نزیکن و هەندێکجاری دیکە زۆر لە یەکتر دوورن، کە زەحمەتە هەموویان لە ژێر چەتری یەك پێناسەی گشتگیر کۆبکرێنەوە، بۆیە باشتر وایە کاتێك پێناسەی ئایین دەکەین، پێناسەی ئایینێکی دیارییکراو بکەین، نەوەك ئایین بە گشتی.

## سایکۆلۆجیای ئایین چییە؟

من بەشبەحاڵی خۆم نەمدەزانی کە ولیەم ڤۆنت ـ کە لای زۆربەی پسپۆڕانی سایکۆلۆجی بە دامەزرێنەری سایکۆلۆجیا دادەنرێت ـ لە کتێبەکانیدا باسی ئایینی کردبێت. لەوانەیە هۆیەکەشی ئەوە بێت کە ئەو کتێبانەی لەسەر ئەم بابەتە بە زمانی ئەڵمانی نووسراوە و کەمتر گرنگیان پێدراوە بە بەراورد بەو کتێبانەی کە باس لە ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی خۆی لە تاقیگەی سایکۆلۆجیدا دەکات، بۆیە بۆ من جێی سەرسوڕمان بوو کە بێلزن (Belzen, 2010)لە لاپەڕە: ١٠٢ بەم شێوەیە باسە لەم بابەتە دەکات:

"بە شێوەیەکی گشتی نەزانراوە کە ڤۆنت بەشێکی باشی لە کارەکانی بۆ سایکۆلۆجیای ئایین تەرخان کردبێت. کتێبەکەی کە بە ناونیشانی Völkerpsychologie سێ بەشی گەورە سەبارەت بەم بابەتە لە ژێر ناونیشانی Mythos und Religion لەخۆی دەگرێت. لە پێشەکی بەشی یەکەمدا ڤۆنت نووسیوویەتی کە بە دڵنیاییەوە ئەفسانە و ئایین بابەتگەلێکی ژیانن بە گشتی کە لە بابەتەکانی زیاتر سەرنجمان ڕادەکێشن بۆ ئەوەی سایکۆلۆجیانە مامەڵەیان لەگەڵ بکەین، هەروەها ئەوەی سەرنجی ڤۆنتی ڕاکێشا ئەوەبوو کە هەرچەندە گرنگیدان بەم بابەتە لەناو بازنەی ئەکادیمی و لە دەرەوەیدا لە زیادبووندایە، بەڵام پسپۆڕانی سایکۆلۆجی توێژینەوەیان لەسەر نەکردووە، ئەمەش نەك لەبەر ئەوەی سایکۆلۆجیستەکان سەرقاڵی شتی

گەورەتر و گرنگتر بووبن، بەڵکو لەبەر ئەوە بووە کە ئەوان سەرقاڵی شتە سەرەتاییە بوون، بە تایبەتی ئەوانەی کە تێکەڵبوون بە بابەتە فسیۆلۆجیەکان، بۆیە کاتیان نەبوو بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە لە ژیانی خودی ڕۆح بکەن بۆ ئەوەی نزیك ببنەوە لەو کێشە ئاڵۆزانەی کە پەیوەندییان بە گەشەکردنی ئەفسانە و ئایین هەیە لە ڕێگای پیادەکردنی ئەو ڕێباز و ڕوانگە تازانەی کە سایکۆلۆجیا بەدەستیهێناون.

بە پێی پێناسەی دێڤید وڵف (Wullf, 2001: 15) "سایکۆلۆجیای ئایین پێکدێت لە جێبەجێکردنی ڕێکوپێکی بیردۆز و مێتۆدە سایکۆلۆجیەکان لەسەر نێوەڕۆکەکانی دابونەریتە ئایینیەکان و ئەو ئەزموون و هەڵوێست و ڕەفتارانەی تاکەکان کە پەیوەندییان پێیانەوە هەیە".

یاکوب بێلزێن (Belzen, 2010:4) بەم شێوەیە وەسفی سایکۆلۆجیای ئایین دەکات: "ئامانج و مەبەست لە سایکۆلۆجیای ئایین بریتییە لە بەکارهێنانی ئامرازە سایکۆلۆجیەکان (وەك بیردۆزەکان، چەمکەکان، بیرۆکە قووڵەکان، ڕێبازەکان و تەکنیکەکان) بۆ شیکردنەوە و تێگەیشتن لە ئایین".

هەردوو پێناسەکەی وڵف و بێلزن لە زۆر ڕووەوە لەیەك دەچن و هاوشێوەی یەکدین، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە پسپۆڕان لە بواری دەروونی هاوڕان لەسەر ئامانجی ئەم لقە لە لقەکانی سایکۆلۆجیا، بەڵام لێرەدا پێمخۆشە بۆچوونی خۆم سەبارەت بە زاراوەی (سایکۆلۆجیای

ئایین) بخەمەڕوو، پێموایە ئەم زاراوەیە دروست نییە و پێنشاز دەکەم زاراوەکە بکرێتە (سایکۆلۆجیای ئایینداری)، لەبەر ئەوەی بابەتی سایکۆلۆجیا بریتییە لە ڕەفتار و هەست و بیری مرۆڤ، نەك لێکۆڵینەوەی واقعێکی دەرەکی، لە دەرەوەی مرۆڤ، هاوشێوەی (ئایین).

پێویستە تێبینییەکی گرنگ بخەمەڕوو، پێش ئەوەی کۆتایی بەم بابەتە بێنم، لە کاتێکدا سایکۆلۆجیای ئایین توێژینەوە لە کۆمەڵێك بابەتی پەیوەندیدار بە ئایین دەکات، هیچ حوکمێك لەسەر خودی ئایینەکە نادات، نە بە پەسندکردن و نە بە دژایەتی، بەڵکو گرنگی بە خودی ئەو ئەزموونە دەدات کە بابای ئاییندار پێیدا تێدەپەڕێت کە پەیوەندی بە ئایینەوە هەیە، بۆ نموونە کاتێك مرۆڤێك بڕوای بە بوونی خودا هەیە، پسپۆڕانی سایکۆلۆجیای ئایین باس لەوە ناکەن کە ئایا ئەم بڕوایەی ڕاستە، یان نا؟ بەڵکو ئەوەی لایان گرنگە چۆنیەتی دروستبوونی ئەم بڕوایە و گەشەکردنی و کاریگەریەتی لەسەر ڕەفتاری کەسەکە، بۆیە دەشێت لە نێو ئەو پسپۆڕانەی گرنگی بە سایکۆلۆجیای ئایین دەدەن کەسانێك هەبن کە خۆیان ئاییندارن نین و دەشکرێت کەسانێکی ئاییندار بن.

## ئایینداری:

زۆرجار تێبینی ئەوەم کردووە ئەو کەسانەی قسە لەسەر ئایین دەکەن، زۆربەی جار مەبەستیان ئاینداریيە، نەك ئایین، ئەم تێکەڵییەش، لەسەر ئاستی تیۆریدا، کۆمەڵێك کێشەی مێتۆدۆلۆجی بۆ کەسەکە دروست دەکات و لە کۆتاییدا ناگاتە ئامانج، بۆ نموونە چەند جارێك گوێ لە کەسێك دەگریت باس لە (ئایین) دەکات، بەڵام بێئەوەی کەسەکە هەست بکات تێبینی دەکەیت ئەو قسە لەسەر "ئاییندارى" کەسەکان دەکات ! بۆ ئەم جۆرە کەسانە، بە تایبەتی ئەگەر توێژەر بن، زۆر گرنگە جیاوازییەکی دیارییکراو لە نێوان "ئایین" و"ئاییندارى" بکەن، بۆ ئەوەی نەکەونە هەڵەی مێتۆدی زەقەوە.

لەوانەیە پێمانوابێت کە ئەگەر لەسەر پێناسەی ئایین ڕێککەوتین، لەوانەیە پێناسەی ئاییندارى ئاسان ببێت، بەڵام لە ڕاستیدا مەسەلەکە لەوە ئاڵۆزترە و مشتومڕێکی زۆر سەبارەت بە چەمکی ئاییندارى (Religiosity) و جۆرەکانی و ئاستەکانی و چۆنیەتی پێوانی ڕەهەندەکانی لە نێوان ئەو توێژەرانەی لە بواری سایکۆلۆجیای ئایینی کار دەکەن، هەیە.

لە خوارەوە ئاماژە بە چەند پێناسەیەك دەکەین بە هیوای ئەوەی کە ئەم چەمکە ڕوون بکاتەوە.

ۆنگ و ریۆ و سلایکیۆ (Wong, Rew & Slaikeu) ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕێککەوتنێکی ڕێژەیی لە نێوان پسپۆڕانی زانستە

کۆمەڵایەتییەکان لەسەر مانای ئاییندارى هەیە، پێیانوایە ئاییندارى بریتییە لە "پەیوەندى تاك بە بیروباوەڕێکى دیارییکراو، یان بە ڕێچکەیەك سەبارەت بەو شتانەى کە پەیوەندییان بە خودا، یان هێزێکى سەرووى سروشتەوە هەیە".

میتکۆ و نایت (Mytko & Knight) پێیانوایە کە ئاییندارى "زۆربەى جار ئاماژەیە بە پابەندبوونى کەسێك بە کۆمەڵێك بیروڕا، یان بەها، یان چەند کردارێك کە لەلایەن ڕێکخراوێك دانراوە کە ئەرکى گەڕان بەدواى هەر شتێك کە پەیوەندى بە خوداوە بێت، خستۆتە سەر شانى خۆى لە ڕێگاى دیارییکردنى چەند گۆشەنیگایەك بۆ جیهانبینى و ژیاندا".

پێش ئەوەى بێمە سەر پێناسەى خۆم بۆ ئاییندارى، پێم باشە لە ڕووە گشتییەکانیانەوە بەراوردێك لە نێوان ئایین و ئاییندارى بکەم.

یەکەم: ئایین سەرچاوەیەکى دەرەکى هەیە، چ ئاسمانى بێت و چ زەمینى، کەچى ئاییندارى سەرچاوەکەى ناوەکییە، واتە مرۆڤە.

دووەم: ئایین لە دەقى پیرۆز پێکدێت، لە کاتێکدا ئاییندارى دەربارەى چۆنییەتى تێگەیشتنى مرۆڤە لەم دەقانە بە پێى ئەزموونى تایبەتى خۆى.

سێیەم: ئایین یەکە، ئاییندار فرەیە چ لە رووى ئاست و چ لە ڕووى جۆر.

بەپێى تێگەیشتنم بۆ چەمکى ئاییندارى، واى بۆ دەچم ئاییندارى ئاماژە بێت بۆ ئەو شێوازەى کە مرۆڤ مامەڵە لەگەڵ ئایین دەکات لەسەر

ئاستی زانین وهەست وڕەفتاریدا. ئەم مامەڵەکردنەش هەندێکجار زۆر ڕووکەشانە و هەندێکجاریش زۆر قووڵ دەبێت. ئەو پێناسەی طه عبدالرحمن (٢٠١٦) بۆ ئاییناری دەکات ئاماژە بۆ ئەو جۆرە مامەڵە قووڵە لەگەڵ ئاییندا کە دەنووسێت:

"ئاییناری بۆ بابای موسڵمان تەنها ڕەفتارێکی پەرستش نییە کە پەنای بۆ ببات بۆ ئارامکردنەوەی دەروونی و پڕکردنەوەی بۆشایی دڵی، بەڵکو ڕێگایەکە بۆ هێنانەدی خودی خۆی لە بووندا، بە شێوەیەك، بوونی موسڵمان لە ئایین وەك بوونیەتی لە جیهان.. " (لاپەڕە: ٢٦)

پێناسەکردنی ئاییناری بە مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ ئاییندا، هەم ئاسانە و لەهەمانکاتیشدا مافی ئەو دیاردەیە دەدات لە ڕووی ئاڵۆزیدا، بە تایبەتی کاتێك قسە لەسەر ئاستەکانی ئەم مامەڵەکردنە دەکەین، بۆیە لە خوارەوە بە کورتی ئەم پێناسەیە ڕوونتر دەکەینەوە:

## یەکەم: مامەڵەکردن لەگەڵ ئایین لە ئاستی مەعریفیدا

ئایین، وەك بوونێکی دەرەکی، یەکەمجار مرۆڤ لەسەر بابەتێکی مەعریفی مامەڵەی لەگەڵ دەکات، واتە مرۆڤەکە بڕوای پێدەهێنێت، بڕواهێنانێك کە بەلای کەمەوە دوو ڕەهەند دەگرێتەوە: ڕەهەندی سەرچاوەی ئایین و ڕەهەندی ناوەڕۆکی ئایین.

هەرچەندە هەندێ لە توێژەران پێیانوایە "بڕواهێنان" یان ئیمان، پرۆسەیەکی فیکریی نییە، بەو مانایەی کە مرۆڤ لەوانەیە قبوڵی بکات بێ ئەوەی هەوڵی ئەوە بدات بە دوای ئەو بەڵگانە بگەڕێت کە

ڕاستیەکەی دەسەلمێنن. ئەگەر ئەم بۆچوونە بۆ هەندێ لە ئایینەکان دروست بێت، مەرج نییە بۆ هەموو ئایینەکان وابێت، لەگەڵ ئەوەشدا بڕواهێنان دەکەوێتە بازنەی مەعریفییەوە.

بێجگە لە بڕواهێنان، کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ناوەڕۆکی ئایین وئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان لەگەڵییەوە هەیە، لە ڕێگای خوێندنەوەی کتێبی ئایینی، یان گوێ گرتن لە وتار، یان پرسیارکردن، بەشێکی دیکەی مامەڵەی مەعریفییە لەگەڵ ئاییندا، بەڵام ئەم بەشە، واتە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ناوەڕۆکی ئایین، بەبێ بڕواهێنان بە سەرچاوەکەی، وەك بەشێك لە ڕۆژهەڵاتناسان دەیکەن، نابێتە ڕەهەندێکی ئاییندارى.

## دووەم: مامەڵەکردن لەگەڵ ئایین لە ئاستی هەڵچوونیدا

هەستەکان، وەك ترس و خۆشەویستی و ڕێز و خەم و شادی و هتد..، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەنجامی درککردن و بیرکردنەوەی مرۆڤن، واتە بەرهەمی لایەنی مەعریفیین. بابەتەکانی ئایینیش، پاش ئەوەی مرۆڤ بڕوایان پێدەکات و بەپێی توانای خۆی زانیارییان دەربارە دەزانێت، جۆرێك لە هەست لای مرۆڤ دروست دەکەن، ئەم هەستانە زۆر تایبەتن و هەندێکجاریش دووبارەبوونەوەیان بە هەمان ئاست و لە هەمان کات و شوێندا دەگمەنە، بەڵام کاریگەری گەورەیان لەسەر مرۆڤ هەیە و تا ڕاددەیەکی زۆر ئاڕاستەی رەفتاری مرۆڤ دەکەن. دەشێ، بۆ نموونە، زۆر جەختکردن لەسەر تۆڵەی خودا و سزادانی تاوانباران و

هتد.. ئاستێکی بەرز لە ترس دروست بکات لەسەر حیسابی هەستەکانی دیکە و ئاییندارێکی ترسدار بەرهەمبێنێت. فراس السواح (٢٠٠٢) ئاماژە بەم لایەنە دەکات، بەڵام ناوی لێدەنێت: ئایینی تاکی، یان ئەزموونی ئایینی تاکی.

**سێیەم: مامەڵەکردن لەگەڵ ئایین لە ئاستی رەفتارییدا**

ڕەفتار، واتە هەڵسوکەوتی مرۆڤە و ئەو کارانەیە کە مرۆڤ دەیانکات، لێرەدا مەبەست ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە پۆلێنکردنی ڕەفتارێك وەك ڕەفتارێکی ئایینی، یان ئاییندار ی ڕەفتاریی، بۆ نموونە خۆشووشتن، ڕەفتارێکی ئایینی نییە، بەڵام ئەگەر بە مەبەستی دەرکردنی لەشگرانیی بێت، ئەوا دەبێتە رەفتارێکی ئایینی.

**ڕەفتارەکانیش دەکرێن بە دوو چەشن:**

**چەشنی یەکەم:** ئەو ڕەفتارانە دەگرێتەوە کە پێویستە لە کاتی دیارییکراو وبەشێوازێکی دیارییکراو ئەنجام بدرێن کە پێیاندەگوترێت سروتەکان، یان پەرستشەکان.

**چەشنی دووەم:** ڕەفتاری دیکەن کە ئەگەر مەبەستی کەسە ئایینی بێت، ئەوا بە ڕەفتاری ئایینی دەژمێردرێت، ئەگەرنا، نا، بۆ نموونە ئەگەر یارمەتیدانی هەژارێك بە پارە تەنها لەبەر بەزەیی هاتنەوە بێت، و کەسەکە هیچ مەبەستێکی ئایینی لە خەیاڵ نەبێت، ئەوا ئەم کارە بە رەفتارێکی ئایینی ئەژمار ناکرێت.

**دەروونزانان بیروبۆچوونی جیاجیان دەربارەی ئایین هەیە، کۆمەڵێك فاکتەر کاریگەری هەبووە لەسەر ئەم بیروبۆچوونانە، هەندێکیان پەیوەندی بە خودی کەسایەتی دەروونزانەکە هەیە و هەندێکی دیکە پەیوەندی بەو بیروبۆچوونەیە کە لەو کاتەدا باو بووە کە ئەم دەروونزانە تیایدا ژیاوە. بە گشتی، هەندێ لە دەروونزانەکان ئایین بە دیاردەیەکی باش دادەنێن لە ڕووی دەروونییەوە و هەندێکی دیکە پێیانوایە کە ئایین کاریگەری خراپی دەروونی لەسەر شوێنکەوتووانی هەیە.**

لە خوارەوە بە کورتی باس لە بۆچوونی هەشت دەروونزانی ناودار سەبارەت بە ئایین دەکەین، بێگومان دەروونزانی بەناوبانگی دیکەش هەن کە لەوانەیە لە ڕووی پلە و پایەی زانستییەوە هیچیان لەم هەشت دەروونزانە کەمتر نەبێ، بەڵام ئەم کارە کتێبێکی تایبەتی پێویستە، هەروەها بە پێی توانا هەوڵم داوە کە پشت بەو کتێبانە ببەستم کە خودی ئەم دەروونزانانە نووسیویانە سەبارەت بە ئایین، واتە سەرچاوەی پلە یەك، بەڵام ئەگەر چنگم نەکەوتبێت، ئەوا پەنام بردۆتە بەر سەرچاوەیەکی پلە دوو، خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە بۆ ئەم کتێبانەیان بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر لەسەر بیروبۆچوونیان.

## بۆچوونی فرۆید[1]

سیگمۆند فرۆید یەکێکە لەو دەروونزانانەی کە بۆچوونێکی نێگەتیڤی سەبارەت بە ڕۆڵی ئایین لە دەروونی مرۆڤدا هەیە. فرۆید، کە دامەزرێنەری قوتابخانەی دەروونشیکارییە، لە کتێبی (Future of an Illusion) پێیوایە ئایین وەك نەخۆشی وەسواسی بە کۆمەڵە و بڕواشی وایە کە بیرۆکە ئایینییەکان، وەك گشت دەستکەوتەکانی دیکەی شارستانیەتی، لە پێویستی مرۆڤ بۆ خۆپاراستن لە هێزی سروشت سەرچاوەی گرتووە.

هەرچەند فرۆید دان بەوە دادەنێت کە ئایین گەورەترین کاریگەری لەسەر مرۆڤایەتی هەبووە، بەڵام پێیوایە کە ئایین وەك نەخۆشی وەسواس منداڵانە و لە ئەنجامی گرێی ئۆدیپ دروست بووە کە بەرهەمی پەیوەندی دوولایەنەیە (خۆشەویستی و ترس) لەگەڵ باوکدا، هەروەها دانیش بەوەدا دەنێت کە باوەڕداری پابەند تا ڕاددەیەکی زۆر لە مەترسی تووشبوون بە نەخۆشیە دەروونییەکان، پارێزراوە، چونکە بە قبوڵکردنی نەخۆشی دەروونی جیهانی، کە مەبەستی ئایینە، بواری نەهێشتووەتەوە بۆ سەرهەڵدانی نەخۆشی دەروونی کەسی (Freud, 1961:43).

---

[1] سیگمۆند فرۆید لە فرێیبێرگ کە ئێستا بەشێکە لە کۆماری چیك لە ١٨٥٦/٥/٦ لە دایك بووە، لە ساڵی ١٩٣٩ و دوای ململانێی لەگەڵ نەخۆشی شێرپەنجەی دەم، کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا پاش ئەوەی داوای بڕێکی زۆری مۆرفین لە پزیشکەکەی کرد. فرۆید بە داهێنەری قوتابخانەی دەروونشیکاری دادەنرێت. سەرچاوە: http://www.biography.com/people/sigmund-freud

## بۆچوونی فرۆم[1]

به بۆچوونی ئێریك فرۆم، ئایین بریتییه له "هەر ڕێبازێك بۆ هزر وكار كه كۆمەڵه كەسێك بەشداری تێدا بكەن، كه دەبێته چوارچێوەیەك بۆ ئاڕاستەكردنی تاك و بابەتێك بۆ پەرستن " كتێبی (التحليل النفسي والدين، اريك فروم، لاپەڕە ٢٥). فرۆم بڕوای وایه پێویستیی مرۆڤ بۆ ڕێبازێكی هاوبەش بۆ ئاڕاستەكردن و بابەتێك بۆ پەرستن، پێویستییەكی ڕەگداكوتاوی مرۆییه، بۆیه بەلای ئەو، مرۆڤ پێویستیی ئایینی هەیه، ئینجا پرسیارەكه ئەوه نییه كه مرۆڤ ئایینی هەیه، یان نا، بەڵكو قسه لەسەر جۆری ئایینەكەیەتی: ئایا ئایینێكه یارمەتی مرۆڤ دەدات پەره به خۆی بدات و توانا شاراوەكانی بەدیاربخات، یان ئایینێكه مرۆڤ تووشی ئیفلیجی دەكات؟

فرۆم ئایینەكان دابەش دەكاته سەر دوو جۆر: ئایینه مرۆڤدۆستەكان (Humanitarian) و ئایینه سەپێنەرەكان (Authoreterian)، جەوهەری ئایینه سەپێنەرەكان بریتییه له ملكەچی بۆ هێزێكی سەرووی مرۆڤ، لەم جۆره ئایینانه مرۆڤ وەك بوونەوەرێكی لاوازی بێ بەها وێنا دەكرێت له بەرانبەر خودایەكی خاوەن هێز و دەسەڵاتێكی بێسنوور، لەم جۆره ئایینانه گەورەترین تاوان سەرپێچیكردنه. ئایینی مرۆڤدۆست، به

[1] ئێریك فرۆم له ١٩٠٠/٣/٢٣ له شاری فرانكفۆرت له ئەڵمانیا له دایكبووه و له ١٩٨٠/٣/١٨ له شاری مورالتۆ له سویسرا كۆچی دوایی كردووه. سەرچاوە: http://www.britannica.com/biography/Erich-Fromm

پێچەوانە، دەربارەی مرۆڤ وهێزیەتی. بە پێی ئەم جۆرە ئایینە، مرۆڤ پێویستە پەرە بە توانا عەقلییەکانی خۆی بدات بۆ ئەوەی لە خۆی بگات ولە پەیوەندی خۆی بە خەڵك بگات، و شوێنی خۆی لە جیهان بدۆزێتەوە، ئەگەر ئامانجی ئایینە سەپێنەرەکان هێنانەدی هەستکردنە بە بێتوانایی، ئامانجی ئایینە مرۆڤدۆستەکان هێنانەدی هەستکردنە بە بەهێزیی، بۆیە مرۆڤ لە ئایینە مرۆڤدۆستەکان دڵخۆشە، بەڵام لە ئایینە سەپێنەرەکان غەمبارە و هەست بە تاوان دەکات (لاپەڕە ٣٨). هەروەها فرۆم پێیوایە کە دەکرێت لە نێو خودی یەك ئاییندا ئایینێکی مرۆڤدۆست و ئایینێکی سەپێنەریش هەبێت (لاپەڕە: ٤٢). لە ڕووی دەروونییەوە، فرۆم لەو بڕوایەدایە کە ئەو مرۆڤانەی خاوەن ئایینێکی سەپێنەرن، خاوەن کەسایەتیەکی مازۆشین، واتە تام و چێژ لە ئازاردانی خۆیان وەردەگرن. (لاپەڕە: ٥٢)

## بۆچوونی ئێلیس [١]

ئەلبێرت ئەلیس یەکێکە لەو دەروونزانانەی کە لە ماوەی نیو سەدە لە توێژینەوە و کاری کلینیکی گۆڕانکاری زۆر بەسەر بۆچوونیدا هاتووە سەبارەت بە ئایین. ئەلبێرت ئەلیس لە کتێبی (The Case Against Religion) لاپەڕە (٥)دا نووسیویەتی:

[1] ئەلبێرت ئەلیس لە شاری پتیسبێرگ لە ساڵی ١٩١٣ لە دایکبووە، لە ٢٠٠٧/٧/٢٤ لە ئەمریکا کۆچی دوایی کردووە و بە داهێنەری شێوازی چارەسەر عەقڵانی دادەنرێت.

"ئێستا، ئایا ئایین، کە لای من مانای ئەو بڕوایەیە کە لەسەر ڕاستی دانەمەزراوە، یان پشتبەستنە بە خوداوەندێکی سەرووی سروشت، یارمەتی مرۆڤەکان دەدات بۆ ئەوەی ئەو خاسیەتە دروستانە بەدی بێنن و لە ئەنجامدا خۆیان لە نیگەرانی و خەم و ڕق و کینە بە دووربگرن؟ بەدڵنیاییەوە وەڵامەکە ئەوەیە کە ئایین بە هیچ شێوەیەك ئەم جۆرە یارمەتییە پێشکەش ناکات، بەڵکو لە زۆر لایەنەوە دەروونددروستی دەخاتە ژێر مەترسییەکی جیدیەوە. پێش هەموو شتێك ئایین لە خزمەتی بەرژەوەندی خودی مرۆڤ نییە، بەڵکو لە بەرژەوەندی خوداوەندە. کەسی ئاییندار پێویستە، بە حوکمی پێناسەی ئایین، خەریکی ئەوە بێت کە ئایا خودا گریمانەییەکەی خۆشی دەوێت، یان نا؟ ئایا ئەو ئاییندارە کاری ڕاست دەکات بۆ ئەوەی لە ژێر نیعمەتەکانی خودا بمێنێتەوە؟ بۆیە ئەم کەسە دەبێت، لە باشترین حاڵەتدا، خۆی لە پلەی دووەمدا دابنێت و دەبێت قوربانیی بە بەرژەوەندییە گرنگەکانی خۆی بدات بۆ ڕازیکردنی ئەو خودایە، ئینجا ئەگەر ئەو کەسە ئاییندارە سەر بە یەکێك لە ئایینە ڕێکخراوەکان بێت، ئەوا دەبێت بە پلەی یەکەم فەرمانەکانی خودا هەڵبژێرێت، پاشان فەرمانەکانی کەنیسە و قەشەکان بە پلەی دووەم و بۆچوون و حەزەکانی خۆشی بە پلەی سێییەم".

هەروەها لە هەمان کتێب لە لاپەڕە (٦) دەڵێت: "ئاییندارى، تا ڕاددەیەکی زۆر، لە بنەڕەتەوە بریتیە لە مازۆشیەت (ئازاردانی خود و چێژوەرگرتن لەم ئازارە) و هەردووکیان دوو جۆرن لە نەخۆشی دەروونی". هەروەها لە لاپەڕە (١٢) دەڵێت: ئایین، تا ڕاددەیەك لە

هەموو حاڵەتەکانیدا، ڕاستەوخۆ دژی ئامانجەکانی دەروونساغییە، چونکە لە بنەڕەتدا ئایین لە مازۆشیەت و ئاڕاستەکردن لەلایەن ئەوانی دیکە و نەبوونی لێبوردەیی، قبوڵنەکردنی گومان، بیرکردنەوەی نازانستی، خۆپاراستنی ناپێویست و خۆبەکەمزانی، پێکدێت".

ئەلبێرت ئێلیس دەڵێت : (Ellis, 1992: 428) "وابزانم من زۆر بە ڕوونی لە نووسینەکانم ئاشکرام کردووە کە ئایین، بە پێناسە ئاساییەکەی، ناعەقلانی نییە و پەشێوی دروست ناکات، بەڵام ئەوەی من ناوی دەنێم ئاییندارى توند (devout religiosity) پێدەچێت کە لە ڕووی هەڵچوونیەوە زیانبەخش بێت، من بەم شێوەیە پێناسەی ئاییندارى توند دەکەم کە بریتیە لە بیروباوەڕێکی ڕەقی، ترسئاکئامێزی (pietistic) نەگۆڕ بە بوون و پشتبەستن بە هێزێکی سەرووی سروشتی، ئاسمانی، باڵا و گوێڕایەڵی و پەرستنێکی توند بۆ ئەم هێزە گریمانەییە.

لە کتێبێکی دیکەی کە لەگەڵ دوو توێژەری دیکە نووسیویەتی (Nielsen, Johnson & Ellis, 2001:55): دەڵێت: "هەرچەندە من پێشتر پێموابوو ئاییندارى، بە تایبەتیش ئاییندارى توند، دژی دەروونددروستییە، بەڵام من زۆرجار بە بیرکردنەوەی خۆمدا چوومەتەوە سەبارەت بە ئایین، لەم دواییەدا گەیشتمە ئەو دەرەنجامەی کە هەڵوێست و بیروباوەڕە ئایینیەکان (هەتاکو ئەو بیروباوەڕانەی کە پەڕگیر و ڕەهاشن) دەشێ هەندێکجار ئەنجامی دەروونی باش بەرهەمبێنن".

## بۆچوونی جێیمس [1]

ولیەم جێیمس (James, n. d.) باس لە دوو جۆر لە ئایین دەکات: "ئایینی دەروونڕوست، یان (Healthy-minded) کە تیایدا چاکە، ئەمە چاکەی ژیانی ئەم جیهانەش دەگرێتەوە، بە شتێکی جەوهەری دادەنرێت کە بوونەوەری ژێر پێویستە گرنگی پێبدات، ئەم جۆرە ئایینە مرۆڤ ئاڕاستە دەکات کە کێشەکانی لەگەڵ خراپەکانی جیهان چارەسەر بکات، ئەمەش بەوەی کە نەیانکاتە چەق، یان فەرامۆشیان بکات لە بیرکردنەوەیدا و لە هەندێکجاریشدا نکوولّی بکات کە ئەم خراپانە هەن". (لاپەڕە:٩٧) ولیەم جێیمس بە جۆری دووەم لە ئایین دەڵێت: (sick soul) واتە ڕۆح نەخۆش. بە بۆچوونی ئەو، لە بەرانبەر کەسانی دەروونڕوست کە بە مەبەست قەبارەی خراپەکاری بچووک دەکەنەوە، کەسانێك هەن کە قەبارەی خراپەکاری گەورەتر دەکەن لەسەر بنەمای قەناعەتێك کە لایەنە خراپەکانی ژیانمان شتی زۆر جەوهەریین، ئەوکات لە مانای تەواوی جیهان تێدەگەین کە خراپە لە چەق دادەنرێت. (لاپەڕە:٩٩)

---

[1] ولیەم جێیمس لە ١٨٤٢/١/١١ لە شاری نیویۆرك لە ئەمریکا لەدایکبووە و لە ١٩١٠/٨/٢٦ کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە فەیلەسوفەکانی قوتابخانەی پڕاگماتیزم و هەندێ لە مێژوونووسانی دەروونزانی بە دامەزرێنەری دەروونزانی دایدەنێن، چونکە یەکەم تاقیگەی دەروونی لە ئەمەریکا دروستکرد. سەرچاوە: http://www.biography.com/people/william-james

## بۆچوونی یۆنگ [1]

کارل گۆستاڤ یۆنگ (Jung,1958) پێیوایە "لەبەر ئەوەی ئایین، بە بێ پێشبڕکێ، سەرەتاترین و جیهانیترین گوزارشتە لە هزری مرۆڤ، بۆیە شتێکی ئاساییە کە دەروونزانی، لە کاتی لێکۆڵینەوەی لە ستراتکۆری دەروونی کەسایەتی مرۆڤ، نەتوانێت خۆی دووربخاتەوە لەو ڕاستییەی کە ئایین، نەك تەنها دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و مێژووییە، بەڵکو مایەی گرنگ و بایەخدانە لەلایەن ژمارەیەکی زۆر لە کەسەکان" (لاپەڕە: ٥).

هەروەها سەبارەت بە پێناسەکردنی ئایین، یۆنگ پێیوایە کە ئایین "بریتییە لە پابەندبوونێکی وریا ورد بە نومینۆسەم، کە کاریگەریەکی داینامیکییە کە لە ئەنجامی کارێکی هەڕەمەکی ویست بەرهەم نەهاتووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە کۆنتڕۆڵی مرۆڤ دەکات کە هەمیشە دەبێتە قوربانی، نەك دروستکەری. نۆمینۆسەم، هۆکارەکەی هەر چییەك بێت، بریتیە لە ئەزموونێکی مرۆڤ لە دەرەوەی ویستی خۆی". (لاپەڕە: ٧)

سەبارەت بە پەیوەندی ڕۆح بە نەخۆشی دەروونی، یۆنگ دەنووسێت: " پێویستە لە کۆتاییدا وا لە نەخۆشی دەروونی بگەین کە بریتییە لە ئازاری ئەو ڕۆحەی کە هێشتا ماناکەی نەدۆزیتەوە، بەڵکو

---

1 کارل گۆستاڤ یۆنگ لە ١٨٧٥/٧/٢٦ لە سویسرا لەدایکبووە و لە شاری زیورخ لە سویسرا لە ١٩٦١/٦/٦ کۆچی دوایی کردووە. یۆنگ شاگردی قوتابخانەی فرۆید بوو، بەڵام لێی جیا بووەوە و قوتابخانەی دەروونزانی شیکاری دامەزراند. سەرچاوە: http://www.biography.com/people/carl-jung

داهێنەرایەتی هەمووی لە بواری ڕۆح و لە بواری پێشکەوتنی دەروونی مرۆڤ هەڵقوڵاوی ئازاری ڕۆحە و هۆی ئەم ئازارەش وەستانی ڕۆحە لە گەشەکردن" لاپەڕە: ٣٣٠-٣٣١.

هەروەها یۆنگ وتەیەکی بەناوبانگی سەبارەت بە گرنگیی ئایین لە ژیانی دەروونیدا هەیە کە دەڵێ: "لە ماوەی سی ساڵی ڕابردوودا، خەڵکێکی زۆر لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان پرسیان لێکردووم، سەدەها نەخۆش لە ژێر دەستم تێپەڕیوون کە زۆربەیان پرۆتستانت بوون و کەمیان جوولەکە بوون و لە کەمتر لە پێنج، یان شەش کەسیان کاسۆلیك بوون، لە نێو ئەو نەخۆشانەی کە لە نیوەی دووەمی ژیانیان بوون، واتە تەمەنیان لە سەرووی ٣٥ ساڵ بوو، یەك کەسیان تێدا نییە کە کێشەکەی لە کۆتاییدا بریتیی نەبێت لە دۆزینەوەی دیدێکی ئایینی بۆ ژیان، دروستە بڵێم هەر یەکێك لەوان نەخۆشکەوتووە، چونکە ئەو شتەی لەدەستداوە کە ئایینە زیندووەکان دەیدەن بە شوێنکەوتووانیان، لە ڕاستیدا هیچیان چاك نەبوونەوە تا دووبارەبوونەتەوە خاوەن دیدێکی ئایینی" (لاپەڕە: ٣٣٤).

لە شوێنکی دیکەی کتێبەکەیدا یۆنگ دەنووسێت: "بە لای منەوە، شان بەشانی لاوازبوونی ژیانی ئایینی، نەخۆشی دەروونی بە شێوەیەکی بەرچاو زیاتر دەبێت" (لاپەڕە: ٣٣٥)

## بۆچوونی ئادلەر[1]

جۆهانسن (Johansen, 2010)باس لە بۆچوونی ئادلەر سەبارەت بە ئایین دەکات و دەڵێت: "بە ڕای ئادلەر، ئایین یارمەتیدەرە لە بەیەکەوە بەستنی خەڵك لە ڕێگای پەرستش و چالاکییە ئایینەکانی دیکەدا، بۆیە ئایین یارمەتیدەرە لە پێشخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی و بەشدارە لە مانەوەی تاك و گرووپە گەورەکان" لە لاپەڕە: ٤٣.

هەروەها ئادلەر ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو دژایەتییانەی لە نێوان ئەو کارانەی هێزە ئایینیەکان دەیکەن و لە نێوان سروشتی بنەڕەتیان تا ڕاددەیەك بەرپرسیارە لەو ڕاستییەی کە بەشێکی زۆر لە خەڵك دژایەتی ئایین دەکەن" لاپەڕە ٤٣. هۆیەکەی دیکە بۆ دژایەتییکردنی ئایین بە ڕای ئادلەر بریتییە لە خراپ بەکارهێنانی ئایین.

جۆهانسن ئاماژەش بەوە دەکات کە ئادلەر لە یەکێك لە نووسینەکانی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەر دامەزراوەیەکی ئایینی، هاوشانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکانی تر، بە بەهادار دادەنرێت ئەگەر مەبەستی خۆشگوزەرانی خەڵك بێت، هەرچەندە ئایین هێزێکی بەهادارە لە پێشخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی وهانی تەندروستی

---

1 ئالفرید ئادلەر لە ١٨٧٠/٢/٧ لە نزیك ڤییەنا لەدایكبووە و بە هۆی نەخۆشی دڵ لە ساڵی ١٩٣٦ لە سكۆتلاندا كۆچی دوایی كردووە. ئادەلەریش شاگردی فرۆید بوو، ئەویش لێی جیا بووەوە و قوتابخانەی دەروونزانی تاکەکەسی دامەزراند. سەرچاوە: www.adler.edu/page/about/history/about-alfred-adler

وخۆشگوزەرانی دەدات، لەهەمانکاتدا ئادلەر ئاماژە بەوەش دەکات کە ئاییندارى دەکرێ ڕۆڵی سەرەکی لە تووشبوون و بەردەوامی ڕەفتاری ناتەندورست لە ڕووی دەروونیەوە بگێڕێت". لاپەڕە: ٤٣.

## بۆچوونی ماسلۆ [١]

ئەبراهام ماسلۆ لە کتێبی (ئایینەکان، بەهاکان و ئەزموونەکانی لووتکە) بۆچوونی خۆی سەبارەت بە ئایین بەم شێوەیە ڕووندەکاتەوە: "ئەوەی من دەیبینم لە مێژووی زۆرێك لە ئایینە ڕێکخراوەکان، جۆرێك لە مەیل بەرەو گەشەکردنی دوو باڵی توندڕەو: باڵی سوفیگەری و تاك لە لایەك و باڵی یاسایی و ڕێکخراوەیی لە لایەکی دیکەوە، تێدایە، ئەو مرۆڤەی کە بە شێوەیەکی قووڵ و ڕاستەقینە ئاییندارە دەتوانێت بە ئاسانی و بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەم دوو باڵە تێکەڵ یەکتر بکات) (Maslow, 1964)(لاپەڕە: ٢).

لە لاپەڕە ١١ لە هەمان کتێبدا، ماسلۆ جیاوازی لە نێوان پرسیارە ئایینیەکان و وەڵامە ئایینەکاندا دەکات و دەنووسێت: "دەتوانین بڵێین

---

1 ئەبراهام ماسلۆ لە ١٩٠٨/٤/١ لە شاری نیویورك لە ئەمریکا لە دایکبووە لە شاری کالیفۆرنیا لە ١٩٧٠/٦/٨ کۆچی دوایی کردووە. ماسلۆ بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی قوتابخانەی مرۆڤدۆستی لە دەروونزانی دادەنرێت. سەرچاوە:
http://www.biography.com/people/abraham-maslow

بابای بێ بڕوا atheist لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەڵسا بە سووتاندنی خانووەکە لە جیاتی دووبارە دروستکردنەوەی، کاتێك پرسیارە ئایینیەکان و وەڵامە ئایینیەکانی بەیەکەوە فڕێدا، چونکە وەڵامە ئایینەکانی قبوڵ نەبوو، واتە پشتی کرد لە بواری ئایینی بە گشتی، لەبەر ئەوەی ئایینی ڕێکخراو کۆمەڵێك وەڵامی پێشکەش کرد کە بابای بێ بڕوا نەیتوانی لە ڕووی فیکرییەوە قبوڵی بکات، واتە وەڵامەکان لەسەر بنەمای بەڵگە دانەمەزرابوون و هەر زانایەکیش کە ڕێز لە خۆی بگرێت، ناتوانێت قبوڵیان بکات، بەڵام ئەوەی ئەو زانایانەی کە زیاتر پێشکەوتوون خەریکن فێری ئەوە دەبن کە ئەگەرچی ئەوان دەبێت ڕازی نەبن بە زۆربەی ئەو وەڵامانەی کە ئایینی ڕێکخراو بۆ پرسیارە ئایینیەکان هەیانە، زیاتر ڕوون دەبێتەوە کە پرسیارە ئایینیەکان لە خودی خۆیاندا، گەڕان بە دوای ئایین، حەز وپێویستیە ئایینەکان لە خودی خۆیاندا، بە تەواوی ڕێزیان لێ دەگیرێت لە رووی زانستیەوە بە حوکمی ئەوەی کە ڕەگی قووڵیان لە سروشتی مرۆڤدا داکووتاو و دەکرێ بە شێوازی زانستیی لێکۆڵینەوەیان دەربارە بکرێت و وەسف بکرێن و توێژینەوەیان لەسەر بکرێت، کەنیسەکانیش هەوڵیان داوە بە تەواوی وەڵامی پرسیارە دروستەکانی مرۆڤ بدەنەوە".

ماسلۆ هەنگاوێکی زیاتریش دەنێت و دەڵێت (لاپەڕە ١١): "لە ڕاستییدا دەروونزانە وجودی و مرۆڤدۆستە هاوچەرخەکان لەوانەیە ئەو کەسە بە نەخۆش، یان نائاسایی دابنێن، لە روانگەیەکی وجودییەوە، ئەگەر ئەو کەسە ڕەچاوی ئەم پرسیارە ئایینیانە نەکات".

ماسلۆ لەم کتێبەیدا باس لە "ئەزموونی لووتکە"، یان Peak Expereince دەکات و دەڵێ: پێغەمبەران کەسانێك بوون کە ئەزموونی لووتکەیان کردووە، بەڵام ئەو زانا ئایینیانەی کە لە شوێنکەوتووی ئەوانن، بەڵام خەریکی لایەنی ڕێکخراوەیی و یاسای ئایینن، کەسانێکن ئەزموونی لووتکەیان نەکردووە.

**لە هەمان کتێبدا ماسلۆ دەنووسێت (لاپەڕە ١٦):**

"ئەگەر ئایینی ڕێکخراو بیەوێت هیچ کاریگەرییەکی کۆتایی هەبێت، دەبێت لە ڕێی ئەو هێزەیەوە بێت کە دەتوانێت لە قوڵایی ناخییەوە تاك بهەژێنێت، دەشێ وشەکان بەبێ ئاگاییەوە و بەبێئەوەی کاریگەری لەسەر قوڵایی ناخی کەسەکە هەبێت دووبارە بکرێنەوە بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئەو وشانە چەند ڕاستن و ماناکانیان چەند جوان بن..... ئەم ئایینانە دەکرێ لە ڕووی کاریگەرییان لەسەر مرۆڤو لەو ڕێیەشەوە، لەسەر جیهان لە ڕادەبەدەر گرنگ بن، بەڵام ئەوە تەنها ڕاست دەبێت ئەگەر ئەو مرۆڤە ئەزموونیان بکات و بە ڕاستی ژیانی پێیانەوە بەند بێت، تەنها لەو کاتەدا ئایینەکان مانا و کاریگەرییان دەبێت".

## بۆچوونی ئالپۆرت [1]

گۆردن ئالپۆرت کتێبێکی بە ناونیشانی: "The Individual and his religion: A Psychological Interpretation".. واتە: تاك و ئایینەکەی؛ لێکدانەوەیەکی دەروونی" نووسییوە و تیایدا هەندێ لە بیروبۆچوونەکانی خۆی لەسەر پەیوەندی نێوان ئایین و دەروونساغی ئاشکرا کردووە. ئالپۆرت نووسیویەتی (لاپەڕە ١٠٩):

"کرۆکی دەروونساغی و بەشێکی گەورەش لە لەشساغی، خۆی لە سروشتی بیروباوەڕی تاکەکان دەبینێتەوە، مەبەست بیروباوەڕە سەبارەت بە هەڵوێستە کۆمەڵایەتیەکان لە جیهانی دونیایدا و بیروباوەڕە مەزنەکانی سەبارەت بە سروشتی ئەو بوونەوەرەی تێیدا دەژی، هەروەها ئالپۆرت پێیوایە لەگەڵ ئەوەی زانستە دەروونییەکان و ئایین زاراوەی جیاواز بەکاردێنن، بەڵام لە زۆر لە لایەنەکانیان بۆچوونی هاوشێوەیان سەبارەت بە بنەماکانی دەروونساغی و سروشتیان و چارەسەریان، هەیە.

---

[1] گۆردن ئالپۆرت لە ١٨٩٧/١١/١١ لە شاری ئیندیانا لە ئەمریکا لە دایکبووە و لە ١٩٦٧/١٠/٩ کۆچی دوایی کردووە. ناوبانگی ئالپۆرت زیاتر لە بواری کەسایەتییە. سەرچاوە: www.britannica.com/biography/Gordon-W-Allport

# سەرنجێك

ئەو دەروونزانانەی کە ئاماژەمان بە بیروبۆچوونەکانیان کرد سەبارەت بە ئایین و ئاییندارى زۆربەیان سەرقاڵی چارەسەری دەروونی بوون و کەم پەرژاونتە سەر توێژینەوە لەم بوارەدا، بۆیە بۆچوونەکانیان، چ لەگەڵیان بیت، یان دژی، مۆرکی تیۆری پێوە دیارە. زۆربەی زۆری توێژینەوەکان لە بواری سایکۆلۆجیای ئایین لەم سی ساڵەی دوایدا کراوە و من لەم باوەڕەدام کە ئەگەر ئەم دەروونزانانەی ئاماژەم بە بیربۆچوونەکانیان کرد تا ئێستا لە ژیاندا مابوونایە، لەوانەیە وەك ئەلبیرت ئەلیس هەندێ لە بیروبۆچوونەکانیان بگۆڕیبایە.

**ئاییندارى، بە ماناى مامەڵەکردنى مەعریفى و هەڵچوون و ڕەفتارى لەگەڵ ئایین، ئاست و فۆڕمەکانى لە کەسێکەوە بۆ کەسێکى دیکە دەگۆڕێت، لە ژیانى ڕۆژانەشدا بۆ نموونە بەراوردى نێوان دوو کەس دەکەین و دەڵێین: فلان کەس ئاییندارترە لە فلان کەس، کەواتە خەڵك بۆ هەڵسەنگاندنى ئاستى ئاییندارى تاکەکان پێوەرێك بەکاردێنن.**

## پێوەر لە سایکۆلۆجیاى ئاییندارییدا

پێوان بەشێکى گرنگە بۆ زۆربەى زانستەکان، چونکە بە هۆیەوە زانیارى ـ داتا ـ ى دروستمان لە بوارى جیاجیادا دەست دەکەوێت، بۆ نموونە پێوانى پەستانى خوێن و پێوانى کێشى لەشى کەسێك کارێکە پێویستە کاتێك کە لە تەندروستى ئەو کەسە دەکۆڵینەوە.

لە بوارى سایکۆلۆجیاش بە هەمان شێوە پێوان پرۆسەیەکى گرنگە، بەڵام لە چەند ڕوویەکەوە جیاوازە لە پێوان لە زانستەکانى دیکەدا، خاڵى سەرەکى جیاوازى لەوەدایە کە ئێمە لە بوارى سایکۆلۆجیا ناتوانین پێوەرى ڕاستەوخۆ بەکاربێنین بۆ پێوانى بۆ نموونە زیرەکى، یان کەسایەتى، یان ئاستى خەمۆکى و دڵەڕاوکێ، هۆیەکەشى ڕوونە،

چونکە ئەم بابەتە دەروونییانە شتی ماددی نین، وەك كێشی لەش، یان باڵابەرزی، بۆیە بە شێوەیەكی ناڕاستەوخۆ ئەو كارە دەكەین، واتە هەڵدەستین بە پێوانی هەندێ ڕەفتار كە ئاماژەن بۆ بوونی توانا، یان بوونی حاڵەتێكی دەروونی لای كەسەكە، كاتێك پێوانەكەش بەم شێوەیە دەبێت، پرسیار لەسەر جێگیری و دروستی پێوەرەكان لە بواری سایكۆلۆجیا دروست دەبن، بۆیە زانستی سایكۆمەتری هەوڵدەدات ئیش لەسەر ئەو ڕێگا و تەكنیكانە بكات كە دڵنیایی دەداتە كەسی توێژەر لە كاتی بەكارهێنانی پێوەر لە توێژینەوە دەروونییەكاندا.

هود و هاوڕێكانی بڕوایان وایە كە بە بێ بوونی پێوانێكی دروست لە توێژینەوەدا، ئەو زانیاریانەی كە كۆكراونەتەوە لە پرۆسەی توێژینەوەدا، بەهایەكی ئەوتۆیان نابێت. لە بواری سایكۆلۆجیای ئاییندا، زۆربەی ئەو پێوەرانەی بەكاردەهێنرێن بریتین لە جۆری ئەو پێوەرەرانەی كە تیایدا كەسەكە وەسفی حاڵ و بیروبۆچوون و هەستی خۆی دەكات. لەم جۆرە پێوەرانە داوا لە بەشداربوو دەكرێت كە وەڵامی چەند پرسیارێك بداتەوە كە بەشێوەیەكی ئەوتۆ داڕێژراون بۆ ئەوەی بتوانن ئەزموونی ئایینی و ڕۆحی جیاجیا بپێوین، لە كۆتایی ساڵەكانی ١٩٩٠، هود و هاوڕێكانی ئاماژە بە زیاتر لە ١٢٥ پێوەر دەكەن كە لە بواری سایكۆلۆجیای ئاییندا بەكاردێن.

توێژەرانی دەروونی بە گشتی، پێوەری ڕاپرسییان بەكارهێناوە بۆ پێوانی ئاییندارى، هەندێكیان پشتیان بە یەك پرسیار بەستووە،

هەندێکی دیکە پێیان باش بووە کە ڕاپرسی پێوەری ئایینداری لە کۆمەڵێك پرسیار پێکبێت، ئەم توێژەرانەی کە کۆمەڵێك پرسیار بەکاردێنن دەکرێن بە دوو گرووپ: گرووپی یەکەم وا تەماشای ئایین دەکەن کە لە یەك ڕەهەند پێکدێت، بۆیە پرسیارەکانی ڕاپرسیەکەیان یەك ڕەهەند دەپیوێت. گرووپی دووەم پێیانوایە کە ئایین فرەڕەهەندە و پێویستە ئەم فرەییەش لە پێوەری ئایینداری ڕەنگبداتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێت زۆربەی زۆری توێژەرانی دەروونی لە بواری ئاییندارێدا سەر بەم گرووپەن.

## پێوەری ئایینداری لای موسڵمانان

ئایین بابەتێکی سەرنجڕاکێش و ئاڵۆزە لە بواری سایکۆلۆجیا و یەکێك لە هۆکارەکانی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئایینە جیاجیاکان لە جیهاندا فۆڕمی جیاجیای ئاینداریيان بەرهەمهێناوە، تاکو یەك ئایينیش چەندەها جۆر و فۆڕمی ئایینداری بەرهەمهێناوە، بۆیە تێگەیشتن لەم دیاردەیە کارێکی ئاسان و سادە نییە، هەرچەندە مامەڵەکردن لەگەڵ ئایینە جیاوازەکان، یان لەگەڵ توخمە هاوبەشەکانیان، کارێکی زۆر زەحمەتە، لێکۆڵینەوە لە ئایینداری لە چوارچێوەی یەك ئایین کارێکی ئاسانترە.

شایەنی باسە کە ئایین بە قووڵی لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە لەو سێ دەیەی دواییدا نەبێت، هەندێ لە پسپۆڕان لە بواری دەروونی (Aten, OGardy & Worthington, 2012)پێیانوایە ئایین دەبێتە

هێزی پێنجەم لە سایکۆلۆجیای سەردەمدا، لەگەڵ ئەو گرنگی پێدانەشدا، دەکرێ بگوترێت زۆربەی ئەو توێژینەوانەی لەسەر ئایینداری لە ڕوانگەی سایکۆلۆجیدا کراوە، جەختی زیاتر لەسەر ئایینی جولەکەو مەسیحی کردووەتەوە بە بەراورد بە ئایینەکانی دیکە (Ghorbani, et al. 2000; Abu Raiya, 2008 ). پسپۆڕانی سایکۆلۆجیش پێیانوایە ئایینداری مانای جیاوازی هەیە لە هەردوو کەلتووری مەسیحیەکان و موسڵمانان ((Abdel-Khalek, 2013). شتێکی ئاشکرایە کە ڕۆڵی ئایین لە جیهانی ئیسلامدا جیاوازە لە ڕۆڵی لە جیهانی مەسیحی ڕۆژئاوایی، ئەبو رەیا (Abu Raiya, 2008) پێیوایە هەرچەندە ئیسلام دووەمین گەورەترین ئایینە لە جیهاندا، بەڵام تا ڕاددەیەك ژمارەیەکی زۆر کەم لە توێژینەوەی مەیدانی لەسەر سایکۆلۆجیای ئایین لە نێو موسڵمانان ئەنجام دراوە، بۆیە توێژەران وای بۆ دەچن کە پێویستە پێوەری تایبەت بە موسڵمانان بۆ لێکۆڵینەوە لە سایکۆلۆجیای ئایینداری لە نێو ئەم کۆمەڵگایانەدا دروست بکرێت.

بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی نەبوونی پێوەرێکی دەروونی بۆ پێوانی ئاستی ئایینداری لە کۆمەڵگا موسڵمانەکان، کۆمەڵێك هەوڵی زانستی لە وڵاتانی جیاجیا دراوە، بۆ نموونە لە ئێراندا قوربانی و هاوڕێکانی (Ghorbani et al. 2000) پێوەرێکیان لەژێر ناونیشانی "پێوەری هەڵوێستی موسڵمانان بەرانبەر ئایین" بەکارهێنا کە لە لایەن وایلد و جۆزێف لە ساڵی ١٩٩٧ دانراوە.

له توێژینەوەیەکی دیکەیاندا، چێن و قوربانی و ئەقبابائی (Chen, Ghorbani, Watson and Aghbabaei, 2013) رەخنەیان له پێوەری ناوبراو گرت که ڕەهەندی ئەزموونیی له ئاییندارى ئیسلامیدا فەرامۆش کردووه، له ئەنجامدا قوربانی و هاوڕێکانی (Ghorbani, Watson, Geranmayepour and Chen, 2014) پێوەرێکیان به ناونیشانی "پێوەری ئەزموونی ئاییندارى موسڵمانان" دروستکرد که له ١٥ بڕگه پێکهات.

هەر له ئێراندا، کاڵخۆران و کەریموڵڵاهی (Kalkhoran and Karimollahi, 2007) ڕاپرسیەکیان بۆ هەڵسەنگاندنی بیروباوەڕی ئایینی، دروستکرد، ئەم ڕاپرسییه چەند پرسیارێکی دەربارەی بڕوابوون به خودا و ژیانی دوای مردن و کاریگەری بیروباوەڕو ڕەفتاری ئایینی، ئازادی و ئارامگرتن و ئومێد و گرنگیی ئایین له ژیاندا له خۆگرت. ئەحمەدی و حوسێن ئابادی (Ahmadi and Hossein-abadi, 2009) لەلایەن خۆیانەوە ڕاپرسیەکیان ئامادە کرد که له چەند ڕەهەندێکی وەك ڕەهەندی ڕۆحی و ڕەهەندی ماددی و ڕەهەندی بەها مرۆییەکان، به ئەنجامگەیاندنی ئەرکه ئایینیەکان، پابەندبوون به شێوازی جلوبەرگی ئیسلامی و جێبەجێکردنی ئەرکه ئایینیەکان، پێکهاتبوو.

له مالیزیاش چەند هەوڵێك لەم بوارەدا دراوه، بۆ نموونه کراوس و هاوڕێکانی (Krauss, Hamzah, Juhari & Abd. Hamid, 2005)

لیستێکیان بە ناونیشانی "لیستی ئاییندارى ـ کەسایەتى موسڵمانان" ئامادەکرد.

جەمال و زەهرا (Jamal & Zahra, 2014) لیستەکەی کراوس و هاوڕێکانی لە پاکستان بەکارهێنا، هەر لە مالیزیادا، عاشور و هاوڕێکانی (Achour, Grine, Mohd Nor and Mohd Yusoff, 2014) پێوەرێکیان بۆ پێوانی ئاییندارى لاى مالیزییەکان دروستکرد کە لە دوو ڕەهەندى سەرەکى پێکهاتبوو: ڕەهەندى بیروباوەڕ و ڕەهەندى پەرستش و نوێژکردن.

لە ئیندۆنیسادا، فرێنچ و هاوڕێکانی (French et al. 2008) ئاییندارییان پێوا بە بەکارهێنانی لیستەیەك لەو ڕەفتارانەی لە موسڵمانی ئیندۆنیسى چاوەڕوان دەکرێت، وەك بەڕۆژووبوون و خوێندنەوەی قورئان و چوون بۆ مزگەوت بۆ نوێژکردن.

لە وڵاتانی عەرەبیشدا کۆمەڵێك هەوڵ دراوە بۆ ئامادەکردنی پێوەری ئاییندارى، بۆ نموونە لە سعودیەدا، البلیخی (Albelaikhi, 1997) پێوەرێکی دانا بە ناونیشانی "پێوەرى ئاییندارى موسڵمان" و لەم کارەدا پشتی بە خوێندکارانی زانکۆ بەست و پێوەرەکەش لە شەش ڕەهەندى ئایینی پێکهاتبوو: کردار، بەها کۆمەڵایەتیەکانی ئایین، بڕوابوون بە بنەما سەرەکییەکان، پێویستی کەس بە ئایین، پشت بەستن بە ئاڕاستەکردنی کرداری وقبوڵکردن بێ پرسیارکردن.

لە کوەیتیش أحمد عبدالخالق (Abdel-Khalek, 2007; Abdel-Khalek & Naceur, 2007) تەنها یەك بڕگەی بەکارهێنا بۆ پێوانی

ئاییندارى جەوهەرى لاى عەرەبى موسڵمان. گلیون و بلجومیدى (Tiliouine and Belgoumidi, 2009) پێوەرێکیان بە ناونیشانى "پێوەرى گشتگیر بۆ ئاییندارى ئیسلامى" بۆ موسڵمانەکانى جەزائیر دروستکرد، ئەم پێوەرە لە ٦٠ بڕگە پێکهات و چوار بوارى گرتەخۆی: باوەڕى ئایینى، کردارى ئایینى، خۆنەویستى ئایینى، دەوڵەمەندى ئەزموونى ئایینى.

صالح (Salleh, 2012) بڕواى وایە ئاییندارى ئیسلامى لە پێنج ڕەهەند پێکدێت:

١. ڕەهەندى خودایى، یان ئاسمانى (Divinistic): بریتییە لە ئاشنابوون بە چەمکى "خودا" و ڕەنگدانەوەى ئەم چەمکە لە هەڵسوکەوتى تاك.

٢. ڕەهەندى باوەڕ: واتە قبوڵکردنى کۆمەڵێك بنەماى نەگۆڕ کە بەشێکە لە سیستمى باوەڕى ئایینى تاکدا.

٣. تێکهەڵکێشى گشتگیر: مەبەست لێى تێکەڵکردنى سێ جۆر لە پەیوەندییە: پەیوەندییەکى ستوونى لە نێوان خودا و مرۆڤ و پەیوەندییەکى ڕوو لە ناوەوە، واتە پەیوەندى مرۆڤ بە خودى خۆیەوە، پەیوەندى ئاسۆیى کە مرۆڤەکان بە یەکتر و بە سروشت دەبەستێتەوە.

٤. ڕەهەندى کاتى: ئاماژە بە گەشتى مرۆڤ دەکات لە ژیانیدا.

٥. ڕەهەندى ئامرازگیرى: ماناى بەکارهێنانى مرۆڤە بۆ گشت کردارەکانى وەك ئامرازێك بۆ پەرستن.

## پێوەری ئاییندارى لاى كورد

له كوردستانی عێراقیش، (البرواری، ٢٠١٣) پێوەرێكی بۆ پێوانی پابەندبوونی ئایینی لای موسڵمانان وەك بەشێك لە تێزی دكتۆراكەی لە زانكۆی سەڵاحەددین، دروستكرد. ئەم پێوەرە لە ٦٠ بڕگە پێكدێت و لە بنەڕەتدا لەسەر خوێندكارانی زانكۆ جێبەجێ كراوە. شایەنی باسە ئەم پێوەرە، ڕەهەندەكانی پابەندبوونی ئاییندارى دیاری نەكردووە، بۆیە دەكرێ وای بۆ بچین كە ئەم پێوەرە تاكڕەهەندانە تەماشای ئەم جۆرە پابەندبوونە دەكات. لە هەڵسەنگاندنی بۆ پێوەرەكانی ئاییندارى لای موسڵمانان، ئەلمونەوەر (El-Menouar, 2014)ئاماژە بە بوونی پێنج كێشەی سەرەكی دەكات:

**كێشەی یەكەم:** لەوەدایە كە تەماشای ئاییندارى ئیسلامی دەكرێت وەك ئەوەی تاكڕەهەند بێت.

**كێشەی دووەم:** لەوەدایە هەندێ لەم پێوەرانە لە پێوەری مەسیحییەوە وەرگێڕدراون بە بەكارهێنانی زاراوەی ئیسلامیەوە.

**كێشەی سێیەم:** لەوەدایە ئەنجامی توێژینەوەكان لە چوارچێوەی چەمكی ڕۆژئاوایی، یان مەسیحی بۆ ئاییندارى لێكدەدرێنەوە.

**كێشەی چوارەم:** بریتیە لە بەكارهێنانی هەندێ لە ئاماژە كە پەیوەندییان بە ئاییندارییەوە نییە.

كێشەی پێنجەمیش بریتیە لە كەموكورتی لە لایەنی ئاماری سەبارەت بە جێگیری و دروستی پێوەرەكان.

سەبارەت بە چەمکی ئاییندارى، سەرۆگلۆ (Saroglou, 2011) مۆدێلێك پێشنیاز دەكات كە لە چوار ڕەهەند پێكدێت: بڕوا، پەیوەندی، ڕەفتار، ئینتیما. بە بۆچوونی سەرۆگلۆ ئەم ڕەهەندانە، ئەگەرچی پەیوەندییان بە یەكەوە هەیە، بەڵام لەیەكتر جیاوازن و دروستە دەرهەق گشت ئایینەكان و كەلتوورەكان. ئەم رەهەندانە دەشێ لە ڕووی ناوەڕۆك و گرنگی و چۆنییەتی پەیوەندییان بە یەكدیەوە جیاوازن بن، ئەمەش فۆڕمی جیاواز لە ئاییندارى بەرهەمدێنێت لە ئایین و كەلتووره جیاجیاكاندا.

لەبەر نەبوونی پێوەرێكی فرەڕەهەند بۆ ئاییندارى بە زمانی كوردی، بە پێویستم زانی هەوڵ بدەم بۆ دروستكردنی پێوەرێكی ئاییندارى بێ ئەوە كەموكورتیانەی كە لەسەرەوە ئاماژەم پێكرد، ئەم هەوڵەش لە دوو توێژینەوەدا بوو:

توێژینەوەی یەكەم دۆزینەوەی بڕگەكانی پێوەر بوو لەگەڵ دەستنیشانكردنی ڕەهەندەكانی ئاییندارى لە نێو كوردی موسڵماندا بۆ دروستكردنی پێوەرێك، هەروەها هەوڵ درا جێگیری ئەم پێوەرەش دەستنیشان بكرێت، لە توێژینەوەی دووەمدا، پێوەرە دروستكراوەكە بەكارهێنرا و بە دوو پێوەری دیكە بەراورد كرا.

لە توێژینەوەی یەكەمدا، كۆی ٢٤٩ خوێندكار لە زانكۆی كۆیە بەشدارییان كرد كە تەمەنیان لە نێوان ١٨ تا ٢٥ساڵ بوو، واتە گەنج بوون. ڕێژەی كچان (٥٤. ٣٪) كەمێك لە ڕێژەی كوڕان (٤١. ٨٪) زیاتر بوو، لە دوای پێداچوونە بە پێوەری جیاجیا لە بواری ئاییندارییدا، چل

بڕگە، یان پرسیار کۆکرایەوە، شەش لەم بڕگانە بە شێوەیەکی "نێگەتیڤانە" داڕێژرا، بۆ وەڵامی هەر بڕگەیەك، یان پرسیارێك پێنج بژاردە پێشکەش کرا، لە شێوەی پێوەری لیکەرت و بەم شێوەیە: هەرگیز (٠)، کەمجار (١)، هەندێکجار (٢)، زۆرجار (٣)، وهەمووجار (٤). پێدانی نمرەکان بۆ پرسیار وبڕگە نێگەتیڤەکان پێچەوانە دەبێتەوە.

پاش بەکارهێنانی تەکنیکی (شیکردنەوەی فاکتەرەکان) ١٦ لە بڕگەکانی ئەو ڕاپرسییەی کە ئامادەم کردبوو لە ژێر چوار فاکتەر (یان چوار ڕەهەند) کۆبوونەوە: (فاکتەری پەیوەندی لەگەڵ خودا، فاکتەری پابەندبوون بە ڕێنماییە ئایینیەکان، فاکتەری ئینتیما و فاکتەری لێبوردن و خۆشەویستی) پەیوەندییەکی مانادار لە نێوان ئەم چوار فاکتەرە تێبینی کرا.

فاکتەری پەیوەندی لەگەڵ خودا سێ بڕگەی گرتە خۆ کە دەربارەی: (سوپاسگوزاری نیعمەتەکانی خودا و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا و نوێژکردن بە ڕێکوپێکی) بوون. ئەو بڕگانەی کە لە ژێر فاکتەری پابەندبوون بە ڕێنماییە ئایینەکان بوون بریتی بوون لە: (پابەندبوون بە ڕێنماییەکانی ئایین سەبارەت بە ڕوخسار و جلوبەرگ، دوورکەوتنەوە لەو شتانەی خودا پێی ناخۆشە، هاوڕێیەتیکردنی ئەو کەسانەی کە ئاییندارن، دوورکەوتنەوە لە شتی حەرام، بە ئەنجامگەیاندنی پەرستشە سوونەتەکان و دوعاکردنی ڕۆژانە)، سێیەم فاکتەر، کە ناوی نرا ئینتیما، بڕگەکانی دەربارەی: (خۆشەویستی ئەو

کەسانەی کە ئاییندارن، گرنگیی ئایین بۆ تاك و کۆمەڵگا، بیرکردنەوە لە لێپرسینەوە لە ڕۆژی دوایی، باشترکردنی پابەندبوونی ئایینی و پشتبەستن بەخودا) بوون. فاکتەری چوارەم، کە ناومان نا لێبوردن و خۆشەویستی، بڕگەکانی باسی ئەمانەی دەکرد: هیوا بە لێخۆشبوونی خودا، پاککردنەوەی دەروون لە تاوانەکان، و خۆشەویستی ئەوانی دیکە لە پێناو خودا.

ئەنجامی توێژینەوەی یەکەم لەگەڵ ئەو مۆدێلە ناگونجێت کە سارۆگلۆ (Saroglou, 2011) پێشنیازی کردووە، ئەم جیاوازیەش لەوانەیە ئاماژەیەك بێت کە ئەم مۆدێلەی سارۆگلۆ گشتگیر نییە و زەحمەتە ببێتە چەترێك بۆ ئاییندار لە گشت ئایینەکاندا، بۆ نموونە یەکەم فاکتەر لە توێژینەوەکەدا بڕوا بە خودا نەبوو، بەڵکو دەربارەی چۆنیەتی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خودا بوو، وا پێدەچێت کە بڕوا بە بوونی خودا پێداویستیەکی سەرەکی ئاییندارییە نەوەك ڕەهەندێك بێت لە ڕەهەندەکانی، واتە بڕوا بە بوونی خودا، یان بڕوانەبوون بە بوونی، مرۆڤی بڕوادار لە بێ بڕوا جودا دەکاتەوە، بەڵام مرۆڤەکان بە پێی فۆڕم و ئاستی ئاینداریيان لێك جودا ناکاتەوە، بێجگە لەم نموونەیە، چەند جیاوازییەکی دیکەیش تێبینی کرا لە نێوان ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوە و مۆدێلەکەی سارۆگلۆ، کە لێرە بواری ئەوە نییە بە درێژی ئەم بەراورده بکەین.

لە توێژینەوەی دووەمدا هەوڵدرا پەیوەندی لە نێوان پێوەری ئایینداری و هەریەك لە پێوەری هارڤارد بۆ شادی و پێوەری فشاری درك پێکراو، بدۆزرێتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ٢٢٠ خوێندکار لە زانکۆی کۆیە و زانکۆی ڕاپەڕین بەشدارییان کرد لە پڕکردنەوەی هەر سێ ڕاپرسیەکە، تەمەنی خوێندکارانی بەشداربوو لە نێوان ١٩ ساڵ تا ٣٧ ساڵ بوو و ڕێژەی کچان کەمێك لە ڕێژەی کوڕان زیاتر بوو.

ئەنجامی ئەم توێژینەوە دەریخست کە پەیوەندییەکی ڕاستەوانە "پۆزەتیڤ" لە نێوان شادی و ئایینداری هەیە، واتە هەرچەندە ئاستی ئایینداری بەرزتربێت، ئاستی هەستکردن بە شادی زیاتر دەبێت وبە پێچەوانەش. هەروەها پەیوەندیەکی پێچەوانە (یان نێگەتیڤ) لە نێوان ئایینداری وفشاری دەروونی هەیە، واتە هەرچەندە ئاستی ئایینداری بەرزتر بێت، ئاستی فشاری دەروونی نزمتر دەبێت وبە پێچەوانەش. لە نێو ڕەهەندەکاندا، ڕەهەندی پەیوەندی بە خوا بەهێزترین پەیوەندی نیشاندا لەگەڵ هەستکردن بە شادی و هەستکردن بە فشاری دەروونیدا.

بە شێوەیەکی گشتی، ئەنجامی ئەم دوو توێژینەوەیە دڵنیامان دەکاتەوە لە جێگیری و دروستی ئەو پێوەرەی ئامادەمان کرد بۆ پێوانی ئایینداری لای تاکی کورد، دەکرێ توێژینەوەی دیکە لە داهاتوودا ئەم پێوەرە بەکاربێنن هەم بۆ ئەوەی زیاتر ڕۆشنایی بخەنە سەر دروستییەکەی و هەم بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی لە نێوان ئایینداری و لایەنەکانی دیکەی دەروونییدا.

## جۆرەکانی ئاییندارى لە قورئاندا

قورئانی پیرۆز، کە سەرچاوەی سەرەکی ئایینی ئیسلامە، لە چەند شوێنێك باسی ئاییندارى دەکات، هەرچەندە وشەی "ئاییندارى" کە بە زمانی عەرەبی بەرانبەر "تدين" دێت، بەو مانایە لە قورئاندا نەهاتووە. توێژەران پەنا دەبەنە بەر وشەی نزیك لەم وشەیە کە لە قورئاندا زۆر باسی لێوە کراوە بۆ نموونە وشەی **"متقي"** یان **"محسن"** و هەوڵیانداوە ئەو خاسیەتانەی خراونەتە پاڵ **"متقي"** و**"محسن"**ەکان، بە هەمان شێوەیە بە خاسیەتی مرۆڤی ئاییندار ئەژماری بکەن، وابزانم ئەم ڕێبازە زۆر دروست نییە، چونکە ئەم دوو سیفەتە باس لە ئاستێکی تایبەتی و نموونەیی ئاییندارى دەکەن کە بەرزە و ڕەنگە زۆربەی مرۆڤە ئاییندارەکان نەگەنە ئەم ئاستە.

سەبارەت بە جۆر و فۆڕمەکانی ئاییندارى لە قورئاندا، چەند تێبینیەکی تایبەتی خۆم هەیە و پێم خۆشە بیخەمە بەردەستی خوێنەر بۆ ئەوەی ببێتە بابەتێکی پێشنیازکراو بۆ گفتوگۆی زانستی، نەك وەك بۆچوونێکی کۆتایی، بۆیە ئەم تێبینیانە دەشێ هەڵە بن و پێویستیان بە پێداچوونەوە هەبێت، بەڵام دەشکرێ دروست بن ویارمەتیدەر بن لە تێگەیشتنێکی ڕوونتر سەبارەت بە ئاییندارى لە ئیسلامدا.

ئایەتی (وَإِذَا غَشِيَهُمْ مَوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ... ) (لقمان: ٣٢) باس لە جۆرێك لە ئاییندارى دەکات کە بە بارودۆخێکەوە بەستراوە، واتە کاتێك کەسەکان

لەناو کەشتیەکن و لەناکاو شەپۆلی گەورەی دەریا تووشی ترسیان دەکات، لەو کاتەدا کەسەکان بە دڵسۆزییەوە (دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ) لە خودا دەپاڕێنەوە، واتە کەسەکان جۆرێك لە ئاییندارە لەو بارودۆخەدا نیشان دەدەن، بەڵام کاتێك بارودۆخەکە گۆڕا، ئاییندارى ئەم کەسانەش دەگۆڕێت (فَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ).. کەواتە جۆرێك لە ئاییندارى بەندە بە بارودۆخ و بە پێی (مفهوم المخالفة) **هەندێ** کەس ئاییندارییان بە بارودۆخ بەند نییە، واتە ناگۆڕێن بە گۆڕانى بارودۆخ، بۆیە دەکرێ بە پێی تەوەرى بارودۆخ باس لە دووجۆر لە ئاییندارى بکەین: ئاییندارى (**عارض**) و ئاییندارى (**ثابت**) جێگیر..

هەرچەندە ئایەتى (أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ... ) (البقرة: ٨٥) باس لە بڕواهێنان دەکات، بەڵام بە حوکمى ئەوەى بڕواهێنان کرۆکى ئاینداریيە، دەکرێ ئاینداریش بەش بەش بکرێت و بەشێکى پیادە بکرێت و بەشێکى دیکە، یان بەشەکانى دیکەى فەرامۆش بکرێت و لە بەرانبەریشیدا، دەکرێ ئاییندارى لاى هەندێ کەس بەش بەش نەبێت و بە گشتى، یان بە (كلي) وەریبگرێت.. بەم پێیە، ئاییندارى دەکرێ لەسەر تەوەرى بەش/ گشت دابەش بکرێت بۆ دوو جۆر: ئاییندارى پارچەیی و ئاییندارى گشتى.

ئایەتى (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انْقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ) (الحج: ١١) باس لە هەندێك کەس دەکات کە خودا

دەپەرستن، بەڵام بە شێوەیەکی ڕووکەشی، نەك قووڵ، بە شێوەیەك کە ئەگەر ئەو جۆرە کەسانی تووشی ڕووداوێکی ناخۆش هاتن، ئەوا واز لە خواپەرستییەکەیان دێنن. ئەم ڕەهەندە دەکرێ پێی بگوترێ ڕەهەندی ستوونی لە ئاییندارى، کە ئەمەش دەکرێت: قووڵ (عميق) بێت و دەکرێ قووڵ نەبێت (حرف)، یان سەرپێی بێت..

بەم شێوەیە دەکرێ ئاییندارى بەسەر هەشت جۆر دابەش بکرێت بە پێی سێ تەوەر: بەردەوامی، چەندی و ئاست:

| جۆری ئاییندار | بەردەوامی | چەندی ئاست |
|---|---|---|
| جۆری ١ | کاتی | هەندێ سەرپێی |
| جۆری ٢ | کاتی | هەندێ قووڵ |
| جۆری ٣ | کاتی | هەموو سەرپێی |
| جۆری ٤ | کاتی | هەموو قووڵ |
| جۆری ٥ | جێگیر | هەندێ سەرپێی |
| جۆری ٦ | جێگیر | هەندێ قووڵ |
| جۆری ٧ | جێگیر | هەموو سەرپێی |
| جۆری ٨ | جێگیر | هەموو قووڵ |

ڕەهەندی کات (یان بەردەوامی) ئاماژە بۆ ئەو ماوەیە دەکات کە مرۆڤەکە تیایدا ئاییندارە، یان پابەندە بە ئایینەکەی، هەندێ کەس بۆ

ماوەیەکی کورت، وەك دەروێشێکی گەرمە تەریقەت، ئاییینداری دەکات و پاشان سارد دەبێتەوە و وازی لێدێنێت. بە پێچەوانەی ئەوەش، کەسانی دیکە هەن کە پابەندبوونیان بە ئایین بەردەوامە، یان بۆ ماوەیەکی دوور و درێژە.

ڕەهەندی چەندێتی ئاماژە بۆ مەودای پابەندبوونی بە ڕێنماییەکانی ئایینیەوە، ئایا کەسەکە پابەند دەبێت بە ئایینەکەی بە گشتی و هەموو بوارەکان، یان تەنها پابەندە بە هەندێك لەم بوارانە؟ ئایا ڕەچاوی ئایین دەکات لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا، یان لە چەند بوارێکی دیارییکراودا؟

ڕەهەندی چۆنیەتی (یان ئاست): ئاماژەیە بە چۆنیەتی پابەندبوونەکە: ئایا پابەندبوونەکەی سەرپێییە و ئاوێتەی ناخی کەسەکە نەبووە، بەڵکو زیاتر ڕووالەتی و عادەتییە؟ یان پابەندبوونەکە قووڵە و لەگەڵ ناخی مرۆڤەکە ئاوێتە بووە؟

نازانم ئەم پۆلێنکردنە چەند تێگەیشتنمان لە سایکۆلۆجیای ئاییینداری لای موسڵمانان ئاسانتر دەکات، بەڵام بیرۆکەیەکی سەرەتایی بوو و پێم باش بوو ڕوونی بکەمەوە بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی پسپۆڕن لە بواری ئایینی ئیسلامدا هەڵیبسەنگێنن و بزانن ئایا چەند ڕاست و دروستە، هەروەها پێم باشە ئەوە کەسانەی لە بواری سایکۆلۆجیای ئاییینداری شارەزان ڕای خۆیان دەربارەی ئەم بیرۆکەی پۆلێنکردنە بدەن.

**بە حوکمی ئەوەی ئاییندارى ڕەهەندی مەعریفی و هەڵچوونی و ڕەفتاری تێدایە، بۆیە شتێکی ئاساییە کە ئاییندارى چ لە ڕووی جۆر و فۆرم و چ لە ڕووی ئاستەوە لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی دیکەوە بگۆڕێت بە پێی گەشەی مەعریفی و هەڵچوونی کەسەکان، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین باس لە گۆڕانی ئاییندارى بکەین بە پێی قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ، بە حوکمی ئەوەی زۆربەی هەر زۆری توێژینەوەکان لە وڵاتانی ڕۆژئاوا کراوە، کە مەسیحیەت ئایینی زۆرینەی خەڵکەکەیە، بۆیە پێویستە کەمێك ئاگادار بین لە گشتاندنی ئەم ئەنجامانە لەسەر ئایین و کەلتووری جیاوازدا.**

## ئاییندارى لە قۆناغی منداڵییدا

ئایین ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانی منداڵاندا دەبینێت. دەربارەی پەیوەندی نێوان ئایین و تەندروستی منداڵ، چیسویك و میرچێڤا (Chiswick & Mirtcheva 2013) توێژینەوەیەکیان لەسەر منداڵان و هەرزەکاران لە تەمەنی ٦ تا ١٩ ساڵ کرد. لەم توێژینەوەیەدا هەوڵدرا پەیوەندی نێوان ئینتیمای ئایینی (واتە کەسەکە سەر بە چ ئایینێکە) و گرنگی ئایین و دووبارەبوونەوەی سەردانی کەنیسە و نێوان حاڵەتی تەندروستی گشتی و دەروونساغی.

شیکردنەوەی ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە بەدیاریخست کە پەیوەندییەکی پۆزەتیڤ، یان ئەرێیی هەیە لە نێوان ئایین و تەندورستیدا بە تایبەتی بۆ ئەوانەی تەمەنیان لە نێوان ١٢ تا ١٥ ساڵە، توێژینەوەکان لەسەر ئایینداری لای منداڵان ئاماژە بەوە دەکەن کە منداڵان لە تەمەنی نێوان ٤ تا ١٢ ساڵیدا بە بێ هیچ زەحمەتیەك ئایین لە کەسانی دیکەوە وەردەگرن، توێژینەوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە بیرۆکە و ئەزموونی ئایینی لە قۆناغی منداڵیدا هەیە، هەرچەندە شێوەکانی جیاوازن و لە تەمەنی ١٠ تا ١٢ ساڵیدا دەگاتە لووتکە و پاشان نزم دەبێتەوە.

زیاتر لە شەست ساڵ پێش ئێستا، توێژینەوە لەسەر ئایینداری لای منداڵان کراوە و چەند نموونەیەك دەخەینە ڕوو کە لەلایەن ئەرگایل (Argyle, 2000)ەوە کورتکراونەتەوە (ل: ١٨ـ ١٩):

هارمس (Harms, 1944) ئاماژە بەوە دەکات کە منداڵ لە سەرەتادا خودا وەك بوونەوەرێکی مەزن وێنا دەکات، پاشان وەك مرۆڤێکی ڕاستەقینە، بۆ نموونە وەك باوکێك، وێنای دەکات.

گۆڵدمان (Goldman, 1964) چاوپێکەوتنی لەگەڵ ٢٠٠ منداڵ کرد کە تەمەنیان لە نێوان ٦ تا ١٥ ساڵ بوو و پرسیاری لێکردن سەبارەت بە تێگەیشتنیان لە هەندێ ڕووداوی ناو ئینجیل وەك چیرۆکی پێغەمبەر موسی و درەختە سووتاوەکە، منداڵان تا تەمەنی نۆ ساڵی، لێکدانەوەی ماددی بەرجەستەیی و ڕواڵەتی بۆ ڕووداوەکان دەکەن، بەڵام لە دوای تەمەنی ١٣ یان ١٤ ساڵیدا، لێکدانەوەی ڕووت و هێمائامێز بۆ ڕووداوەکان دەکەن.

ڤێرگۆت (Vergote, 1969) لێکۆڵینەوەکەی لەسەر کاسۆلیکەکانی بەلجیکا کرد و گەیشتە ئەوەی کە چەمکی خودا لە توندی بە دایك و باوکەوە بەندە، لە تەمەنی ٥ تا ٧ساڵیدا منداڵان دایك و باوکیان لە خودا جودا دەکەنەوە و لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا وێنای خودا وەك بوونەوەرێکی نادیار کە لە هەموو شوێنکدا هەیە، دەکەن، هەروەها ئاماژە بەوە دەکات منداڵان لە تەمەنێکی زووەوە نوێژ دەکەن ئەگەر فێربکرێن، بەڵام وا دەزانن کە نوێژ، یان (نزا) کاریگەرییەکی ئەفسووناوی هەیە.

پێترۆڤیج (Petrovic, 1988) 60 منداڵی تەمەن چوار ساڵی تاقیکردەوە و پرسیاری لێکردن کە کێ شتە سروشتیەکانی وەك ئاسمان و زەوی وبەردی دروستکردووە، ٦٨٪ بڕوایان وابوو کە خوا ئاسمانی دروست کردووە و٥٣٪ بڕوایان وابوو کە بەردەکان هەر هەبوون، هەروەها کە پرسیاری لێکردن خودا چۆنە؟ لە وەڵامدا ٤١٪ گوتیان کە خودا وەك مرۆڤێکی ڕاستەقینە وایە و ٢٥٪ گوتیان کە خودا مرۆڤێکی بێ جەستەیە.

تامینێن (Tamminen, 1994)پرسیاری لە سێ هەزار منداڵی فینلەندی کرد کە تەمەنیان لە نێوان ٦ تا ٢٠ ساڵ بوو کە زۆربەیان لەسەر مەزهەبی لۆپەری پەروەردە کرابوون. کاتێك کە پرسیاریان لێکرا: ئایا هەستت کردووە خودا لێت نزیکە؟ ٩٥٪ لە منداڵە بچووکەکان بە (بەڵێ) وەڵامیان دایەوە، بەڵام ئەم ڕێژەیە بە زیادبوونی تەمەن کەم

دەبێتەوە. هەمان ڕێژە لەو منداڵانە هەستیان کرد کە خوا ئاڕاستەی ژیانیان دەکات بە تایبەتی لە کاتی ناخۆشی و ترسدا.

چامبەرلین و هۆڵ .Chamberlain, T. J. & A. Hall, C. A (2000) بە کورتی باسی قۆناغەکانی گەشەکردنی بڕوا دەکەن لە قۆناغە جیاجیاکانی تەمەنی مرۆڤ بە پێی بیردۆزی جێیمس فۆلەر. جێیمس فۆلەر باس لە شەش قۆناغ دەکات بۆ گەشەکردنی بڕوا (ئیمان) بە پێی گەشەی تەمەنی مرۆڤ، بەم شێوەیە:

یەکەم: Primal Faith واتە بڕوای سەرەتایی، یان بەرایی: ئەم قۆناغە مامەڵە لەگەڵ گەشەکردنی ئەو متمانەیە دەکات کە لە میانەی پەیوەندییەکی دوولایەن لەگەڵ دایك و باوك، دەوروبەر و کەسانی دیکە دروست دەبێت، پاشان زەمینە بۆ گەشەکردنی چەمکی خودا خۆش دەکات، ئەمەش لە قۆناغی شیرەخۆری ڕوودەدات.

دووەم: Intuitive-Projective Faith واتە بڕوایەك لەسەر بیرنەکردنەوە و ڕەنگدانەوە دروست بووبێت: ئەم قۆناغە جەخت لەسەر ئەندێشە (خەیاڵ) دەکات کە بە هۆی چیرۆکەکان و هێماکان دەوروژێنرێت و هێشتا لۆجیك سنووری بۆی دانەناوە، لەم قۆناغەدا خاسیەتی سەرەکی بڕوا بیرکردنەوەی ئەفسووناوی و خەیاڵە، ئەم قۆناغە لە سەرەتایی قۆناغی منداڵیدا بەدیار دەکەوێت.

سێیەم: Mythic-Literal Faith واتە قۆناغی بڕوای ئەفسانەیی و ڕووکەشی: ئەم قۆناغەش لە قۆناغی تەمەنی منداڵی سەرهەڵدەدات، منداڵان لەم قۆناغەدا تونای بیرکردنەوەی لۆجیکیان گەشە دەکات و

دەست دەکەن بە پۆلێنکردن و ڕێکخستنی جیهان بە پێی پۆلێنەکانی هۆ، شوێن، کات، دەتوانن لە ڕوانگەی کەسانی تر تێبگەن و پەی بە ماناکانی ژیان و چیرۆکەکان ببەن. ئەم قۆناغە دەبێتە هۆی بەدەستخستنی بڕوایەك کە ڕووالەتی بێت و بە شێوەیەکی سەرەکی هەمان ئەو بڕوایە بێت کە دایك و باوك هەیانە.

چوارەم: Synthetic-Conventional Faith واتە بڕوایەکی ئاوێتەبوو و تەقلیدی، ئەمەش لە قۆناغی هەرزەکاریدا سەرهەڵدەدات، لەم قۆناغەدا توانا مەعریفییەکانی منداڵ گەشەی زیاتر دەکات کە ئەمەش یارمەتی منداڵ دەدات بۆ ئەوەی ڕوانگەی کەسانی دیکە بە هەند وەربگرێت و وێنە جیاجیاکانی خودی خۆی لە چوارچێوەی شوناسێکی تۆکمە ڕێکبخات، ناوەڕۆکی بڕوا لەم قۆناغەدا هێشتا هەر تەقلیدیە و هاوشێوەی بڕوای دایك و باوك و هاوڕێیان و کەسایەتییە گرنگەکانە.

پێنجەم: Individuative-Reflective Faith واتە بڕوایەکی تاکی و دامەزراو لەسەر بیرکردنەوە: ئەم قۆناغەی بڕوا لە قۆناغی تەمەنی لاویدا دەبێت، لێرەدا تاکەکان بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانە بیر لە بیروباوەڕ و بەهاکانیان دەکەنەوە و خۆیان وەك بەشێك لە سیستمێکی کۆمەڵایەتی فراوانتر دەبینن، لەم قۆناغە دەبنە خاوەن بڕوای خۆیان و لەلایەکەوە دەسەڵات دەبێتە هێزێکی ناوەکی و لەلایەکی دیکەوە بەرپرسیاریەتی، هەلبژاردنی پابەندبوون و بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆجیا وشێوازی ژیانیان، هەڵدەگرن، ئەم قۆناغە گومان و پرسیارکردن و

هەندێکجار رەتکردنەوەی بیروباوەڕی تەقلیدیش دەگرێتەخۆی. بە بۆچوونی فۆلەر ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە ڕێخۆشکەرە بۆ ئەوەی کەسەکە رەخنەیەکی وریایانە لە پابەندبوونی خۆی بگرێت لە بواری پەیوەندییەکان و بواری پیشەیدا.

شەشەم: Conjunctive Faith ئەم قۆناغە لە نیوە تەمەندا سەرهەڵدەدات. ئەم قۆناغە مۆرکی پارادۆکسی (شتی دژەیەك) تێدایە کە تیایدا مرۆڤ باوەش بۆ جەمسەریەتی لە ژیانیدا دەکاتەوە کە یەکێکیان بریتییە لە پێویستی وەرگرتنی لێکدانەوەی جیاواز بۆ واقیع، وەرگرتنی هێما و چیرۆك، مەجاز و ئەفسانە.

حەوتەم: Universalizing Faith ئەم قۆناغەش لە ناوەڕاستی تەمەندا سەرهەڵدەدات، بە پێی بۆچوونی فۆلەر، زۆربەی کەسەکانە ناگەنە ئەم قۆناغە کە لەسەر بنەمای یەکبوون لە هێزی بووندا دامەزراوە، واتە ئەو کەسانە دەگەنە ئەم قۆناغە وا تەماشای دید و پابەندبوونی خۆیان دەکەن کە ئازادیان دەکات لەوەی کە وەبەرهێنان لە بواری خۆشەویستیدا بکەن و خۆیان تەرخان بکەن بۆ زاڵبوون بەسەر پەرتەوازەیی و چەوساندنەوە و توندوتیژی و هەوڵدان بۆ بەرژەوەندی گشت مرۆڤایەتی لە دادپەروەری و خۆشەویستیدا. (لا ١٢-١٤)

بیردۆزی قۆناغەکانی گەشەکردنی بڕوا لای فۆلەر گەلێك رەخنەی لێگیراوە. هەندێ لەم ڕەخنانە بە کورتی لە خوارەوە باس دەکەین کە هود و هاوڕێکانی ئاماژەیان پێکردووە (Hood, et al. 2009: 83)

١. ئەو چەمکانەی فۆلەر بەکاریانی هێناوە ئاڵۆزن و تێگەیشتنیان زەحمەتە.

٢. ئەم بیردۆزە نەیتوانیوە توێژینەوەی ئیمپریقی تۆکمە بەرهەم بێنێت.

٣. فۆلەر نەیویستووە شیکردنەوەی ئاماری بۆ ئەنجامەکانی بکات و ئەو کارانەی فەرامۆش کردووە کە لە بواری سایکۆلۆجیای ئایین کراون.

٤. بیردۆزەکە زیاد لە پێویست و بە شێوەیەکی بەڵگەنەویستانە پشتی بە گەشەکردنی لۆجیکی بەستووە.

پێویستمان بە توێژینەوەی زانستی هەیە لە سەر کەسانی موسڵمان لە قۆناغی تەمەنی جیاجیادا، بۆ ئەوەی بزانین ئایا ئەم بیردۆزە لەسەر موسڵمانانیش جێبەجێ دەبێت، یان تایبەتە بە مەسیحییەکان کە سامپڵی سەرەکی بوون بۆ پەرەپێدانی ئەم بیردۆزە، تا ئەم جۆرە توێژینەوە زانستیانە نەکرێن لەسەر ئەم بابەتە، ناتوانین گشتاندن بۆ ئەم بیردۆزە بکەین.

## ئاییندارى لە قۆناغى هەرزەکارى و گەنجیدا

قۆناغی هەرزەکاری یەکێکە لە قۆناغە هەستیارەکانی ژیانی مرۆڤ، ستانلی هۆڵ ناوی لەم قۆناغە ناوە: قۆناغی تەنگژە و ڕەشەبا، لەبەر ئەو گۆڕانکارییە گەورە و لەناکاوانەی لە بواری جەستەیی و دەروونی و عەقڵییەوە بەسەر هەرزەکاندا دێت.

پسپۆڕانی دەروونی هەر لە زووەوە درکیان بە گرنگی قۆناغی هەرزەکاری کرد سەبارەت بە گەشەکردنی ئاییندارى، ئەوەتا ستانلی

هۆڵ، کە پێشەنگە لە بواری توێژینەوە لە بواری هەرزەکاریدا، پێیوایە کە قۆناغی هەرزەکاری ماوەیەکی زۆر گرنگە بۆ گەشەکردنی ئاییندارى و ڕۆحانیەت، (هۆڵ) قۆناغی هەرزەکاری وەك لەدایکبوونێکی نوێ دەبینێت کە هاوکات کێشە دەروونییەکان و گۆڕانی ئایینی تێدا زیاد دەکات بە هۆی سەرهەڵدانی فاکتەری جینسی و فاکتەری بایۆلۆجی دیکە (لاپەڕە: ٢٦٠).

هەروەها نیلسن پێیوایە پەیوەندی نێوان گۆڕانکاری ڕۆحی و ئایینیەکان لە قۆناغی هەرزەکارییەوە لەگەڵ لایەنەکانی گەشەی دەروونی لە ڕێگای گەشەکردنی شوناسەوە دێتەدی (لاپەڕە: ٢٦٣). جێیمس مارشیا لەسەر تەوەری "گەڕان" و"پابەندبوون" ئاماژە بۆ چوار جۆر لە شوناس دەکات:

جۆری یەکەم لە شوناس بریتییە لە "دەسکەوت" کە کەسەکە لە ڕووی پابەندبوون و گەڕان لە ئاستێکی بەرزدایە.

جۆری دووەم لە شوناس بریتییە لە "داخراوی" کە خاوەنەکەی لە ڕووی پابەندبوونەوە لە ئاستێکی بەرزدایە بەبێ گەڕان.

جۆری سێیەم لە شوناس بریتییە لە "هەڵوەسراوەیی" کە تیایدا کەسەکە لە گەڕاندا لە ئاستێکی بەرزدایە، بەڵام پابەند نەبووە بە شتێك.

جۆری چوارەم لە شوناس بریتییە لە "پەرتی" کە تیایدا کەسەکە نە دەگەڕێت و نە پابەندیشە بە هیچ شتێك.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئایین و شوناس، نێلسن پێیوایە کە ژیانی ئایینی کاریگەری لەسەر دروستبوونی شوناس هەیە، بەشدارییکردن لە گرووپی ئایینیدا کە تیایدا ئەندامی ئەم گرووپە فێری سیستمێکی دیارییکراو دەکرێ بۆ لێکدانەوەی رەفتار کە یارمەتی گەشەپێدانی شوناس دەدات بە تایبەتی ئەوانەی گەڕان بەدوای ئاسایش لایان گرنگە (لاپەڕە: ٢٦٥).

بیردۆزەی فێربوونی کۆمەڵایەتی کە ئەلبرت بەندۆرا پێشنیازی کردووە بە چوارچێوەیەکی گونجاو دانراوە بۆ لێکدانەوەی ئایینداری، ئەم بیردۆزە جەخت لەسەر تێبینیکردن و فێربوون لە کەسانی دیکە دەکات، بە پێی ئەم بیردۆزە نموونەی کەسانی ڕۆحانی، یان ئاییندار، ئینجا چ لە ڕابردوو بن، یان لە ئێستادا، یان کەسانی گرنگ بن لە ژیانی کەسەکە کە ڕۆڵی سەرەکییان لە گەشەکردنی ڕۆحی و ئایینیدا هەیە.

## کاریگەری دایك و باوك

هود و هاوڕێکانی ئاماژە بە ژمارەیەکی زۆر لە توێژینەوە دەکەن کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر کاریگەری دایك و باوك لەسەر ئاستی ئایینداری منداڵەکانیان کردووە، بە شێوەیەکی گشتی وادیارە ڕۆڵی دایك کاریگەرییەکی زیاتر هەیە لە باوك لەسەر ئایینداری منداڵەکاندا هەرچەندە هەندێ لە توێژینەوەکانی دیکە ئاماژە بە کاریگەری دایك و باوك لەسەر منداڵەکانیان کە هەمان ڕەگەزن، واتە کاریگەری دایك لەسەر کچان و هی باوك لەسەر کوڕەکان، دەکەن.

وێڕای ئەوەش توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کاریگەری دایك و باوك گەورەترە سەبارەت بە لایەنی دیاری ئاییندارى، بۆ نموونە چوون بۆ کەنیسە، بە بەراورد بە لایەنە شاردراوەکانی ئاییندارى، وەك هەڵوێست بەرانبەر ئایینی مەسیحیەت. لاپەڕە: ١١٥

ژمارەیەك لە توێژینەوەکان، کە هود و هاوڕێکانی ئاماژەیان پێدەکەن، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی جۆری پەیوەندی نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان تا ڕاددەیەکی زۆر کاریگەری لەسەر پرۆسەی بە کۆمەڵایەتیکردنی ئایینی هەیە (religious socialization) لاپەڕە: ١١٧.

ئەگەر پەیوەندی نێوان دایك و باوك ومنداڵەکانیان باش بێت، بەو مانایەی کە پەیوەندییەکی نزیك و گەرموگوڕ، کەمتر منداڵەکان دژی ئایین دەوستنەوە، بۆیە ئەو دایك و باوکانەی کە دەیانەوێت منداڵەکانیان ڕەوتێکی ئایینی لە ژیانیاندا پیادە بکەن، پێویستە پەیوەندییان لەگەڵ منداڵەکانیان لە ئاستێکی زۆر باشدا بێت، ئەگینا ئەو بەرهەمەی چاوەڕوانی دەکەن، دەستیان ناکەوێت، جیاوازی دایك و باوك لە فۆڕم و ئاستی ئاییندارى کاریگەری لەسەر لایەنی دەروونی منداڵەکانیان هەیە.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئاستی ئاییندارى دایك و باوکان لەگەڵ دەروونساغی منداڵەکانیان لە پێش قۆناغی هەرزەکاری، کۆمەڵێك توێژەر لە هۆڵەندا (Jagt-Gelsma, Vries-Schort, Jong, Verhulst, Ormel, Veenstra, Swinkels & Buitelaar 2011)لەم بابەتەیان کۆڵیەوە. سامپڵی توێژینەوەکە پێکهات لە ٢٢٣٠ منداڵ لە تەمەنی ١٠ تا

١٢ ساڵیدا، بۆ کۆکردنەوەی زانیاری پێویست، زانیاری لە خودی منداڵەکان و دایك و باوکیان و مامۆستاکانیان کۆکرایەوە. خاڵێکی گرنگی دیکەیش لەم توێژینەوەیە دۆزینەوەی کاریگەری ناڕێکی دایك و باوك لە ئاستی ئاییندارییدا (واتە جیاوازییان لەم بوارەدا).

ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کاریگەری ئاییندارى دایك لەسەر بەدیارکەوتنی نیشانە ناوەکیەکان بەندە بە بوونی ناڕێکی (جیاوازی) ئاییندارى لە نێوان دایك و باوك، کوڕەکان زیاتر نیشانەی دەرەکییان لەسەر بەدیارکەوت کاتێك جیاوازی ئاییندارى لە نێوان دایك و باوکیاندا هەبووایە، لە دەرەنجامدا، توێژەران ئاماژەیان بەوە کرد کە ئاییندارى دایکان و باوکان و بوونی جیاوازی لە نێوانیاندا کاریگەری لەسەر دەروونساغی منداڵەکانیان لە قۆناغی پێش هەرزەکاریدا هەیە.

## کاریگەری هاوڕێیان

توێژەران لە بواری قۆناغی هەرزەکارییدا (بۆ نموونە: دێیسی، تراڤێرز وفیۆر (Dacey, Travers & Fiore, 2009:326) جەخت لەسەر ڕۆڵی گرنگی هاوڕێیان لەسەر کەسایەتی هەرزەکار دەکەن، بە بەراورد بە کاریگەری دایکان و باوکان هاوڕێیان کاریگەرییان لەسەر ئاستی ئاییندارى هەرزەکار کەمترە. توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کاریگەری هاوڕێیان لەگەڵ کارگێڕی سیستمی فێرکردن تێکەڵ یەکتر دەبن.

هەندێکی دیکە لە توێژەرەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کاریگەری هاوڕێیان لەسەر هەندێ لەلایەنەکانی ئاییندارى لاوازە، وەك جێبەجێکردنی

ئەرکە ئایینیەکان، بەڵام کاریگەرییان لەسەر هەندێ لایەنی دیکە بەهێزە، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە بەشداربوونە لە چالاکییە بە کۆمەڵەکان (Hood et. a. 2009: 118).

کۆمەڵێك فاکتەری دیکە هەن کە کاریگەرییان لەسەر گەشەکردنی ئایینی لای هەرزەکار هەیە، وەك سیستمی فێرکردن، دامەزراوەی ئایینی، بۆ نموونە مزگەوت لە ئیسلام و کەنیسە لە مەسیحیەت، رەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆڵی خوشك و برایان لە خێزاندا، قەبارەی شار، هۆیەکانی ڕاگەیاندن و خوێندنەوە و هی دیکەیش.

سەبارەت بە لێکدانەوەی گەشەکردنی ئایینی لای هەرزەکار، هود و هاوڕێکانی ئاماژە بە مۆدێلی ئۆزۆراك (Ozorak) دەکەن کە ناوی دەنێن: گریمانی بەجەمسەربوون، مۆدێلی ئۆزۆراك جەخت لەسەر لایەنی کۆمەڵایەتی - مەعریفی دەکات لە پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوونی ئایینیدا. بە پێی ئەم مۆدێلە ئەو هەرزەکارانەی کە ئاستی ئایینداریيان بەرزە، لەگەڵ گەشەکردنیان ئاستەکەیان بەرزتر دەبێتەوە، بە پێچەوانەشەوە ئەو هەرزەکارانەی ئاستی ئایینداریيان نزمە، لەگەڵ گەشەکردنیان ئەم ئاستە نزمتر دەبێتەوە و هەرزەکارەکە لە ئایین دوورتر دەبێتەوە.

بە حوکمی ئەوەی ئەم توێژینەوانە لە کۆمەڵگای رۆژئاوایی کراوە، ئەگەری ئەوە هەیە زەحمەت بێت گشتاندن بە ئەنجامەکانی لەسەر کۆمەڵگاکانی دیکە بکەین، بەهەرحاڵ، ناکرێ ڕۆڵی هاوڕێیان لە گەشەکردنی ئایینی هەرزەکاران بەهەند هەڵنەگیرێت، ئەگەرچی کاریگەرییەکەشی کەم بێت.

## ئاییندارى لاى پێگەیشتووان:

سەبارەت بە گۆڕانکارى لە ئاییندارێدا لاى پێگەیشتووان توێژینەوەکان ئاماژە بە ئەنجامى جیاجیا دەکەن، هەندێکیان پێیانوایە لەم تەمەنەدا گۆڕانکارى جۆریى لە ئاییندارى ڕوودەدات کە هەندێکجار دەگاتە ئاستى گۆڕینى ئایین، هەندێکى دیکە لە توێژەران باس لەوە دەکەن ئاییندارى لەم تەمەنەدا دەگاتە لووتکەى و زاراوەى "ئاییندارى پێگەیشتوو"ى بۆ بەکاردێنن.

هەندێ لە توێژەران پێیانوایە لەگەڵ جێگیر بوونى بارى کۆمەڵایەتى کەسى پێگەیشتوو، بۆ نموونە کاتێك خێزان پێکدێنێت و بارى ئابوورى کاتێك دەبێتە خاوەن پیشەیەك و داهاتێکى جێگیر، لەگەڵ جێگیربوونى بارى دەروونى کەسى پێگەیشتوو، ئاییندارییەکەشى جێگیر دەبێت.

بە پێى ئەو زانیارییانەى لە ماوەى نێوان ١٩٧٢ تا ٢٠٠٦ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانى ئەمەریکا لەلایەن General Social Survey کۆکراوەتەوە، وا بەدیار دەکەوێت کە ڕەهەندەکانى بڕواهێنان و نزاکردن و چوون بۆ کەنیسە لە نێوان ئەو کەسانەى تەمەنیان لە نێوان ١٨ بۆ ٣٩ ساڵە بە بەراورد بەو کەسانەى تەمەنیان لە نێوان ٤٠ بۆ ٥٠ ساڵە زیادى کردووە. زۆرترین زیادەش لە بوارى نزاکردن و چوونە بۆ کەنیسە .(Hood et al,2009: 143)

سەبارەت بە گەشەکردنى ئاییندارى لاى پێگەیشتووان چەند بیردۆزێك پێشنیاز کراوە، لە خوارەوە باسى دوو لەم بیردۆزانە دەکەین.

## بیردۆزی گەشەی پۆستفۆڕماڵ

ئەم بیردۆزە لەلایەن سینۆت (Sinnott) پێشنیاز کراوە و بڕوای وایە مرۆڤەکان لە دوای قۆناغی فۆڕماڵ، کە لای پیاجێ دوا قۆناغە، بۆ قۆناغی پۆستفۆڕمال، یان دوای فۆڕماڵ گەشە دەکەن. بیرکردنەوە، یان لۆجیکی پۆستفۆڕماڵ بوارمان پێدەدات کە زانیارییە دژ بە یەکەکان ڕێکبخەین، بە تایبەتی ئەو زانیارییانەی کە پەیوەندییان بە مەسەلە ڕۆحی و ئایینییەکانەوە هەیە، ئەم هەنگاوەش گرنگە بۆ گەشەکردنی ڕۆحانیەتێکی پێگەیشتوو. بیرکردنەوەی پۆستفۆڕمال بواری ئەوەشمان پێدەدات کە دان بە سنوور بۆچوونەکانماندا بنێین و قبوڵی شتی پێچەوانەی یەکتر بکەین و دان بەوەشدا بنێین کە لەوانەیە هەندێ شت هەر بە نەزانراوی بمێنێتەوە و ئێمە نەتوانین پەی پێیان ببەین (Nelson,2009: 302-303 ).

## بیردۆزی هەڵبژاردنی عەقڵانی

ئەم بیردۆزە، کە لەلایەن لۆرێنس ئیناکۆن (Lawrence Iannaccone) پێشنیاز کراوە، پێیوایە ئایین شتێکە کۆمەڵە شتێك بەرهەمدەهێنێت، وەك ڕەزامەندی تاکەکەسی و قەرەبووەکان بۆ کۆمەڵێك پاداشت کە مرۆڤ ئارەزوویان دەکات وەك نەمری. بە پێی ئەم بیردۆزە خەڵك بە شێوەیەکی عاقلانە ڕەفتار دەکەن و بڕیار دەدەن بە شێوەیەك کە زیاتر قازانج بکەن و لەبەر ئەوەی سەرمایەی ئایینی لە هەندێ گرووپدا داواکراوە، خەڵك هەوڵ دەدەن کە ئینتیمای ئایینیان نەگۆڕن، بۆ

ئەوەی ئەو بەهایەی لە ئەنجامی ئەم ئینتمایە دەستیانکەوتووە، لە دەستی نەدەن. ئەم بیردۆزە بەکارهاتووە بۆ تەفسیرکردنی چەند دیاردەیەکی ئایینی بۆ نموونە مانەوەی ئاییندارى لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ئاستێکی بەرز ولەهەمانکاتدا دابەزینی ئاییندارى لە وڵاتانی ئەوروپادا (Nelson, 2009: 291-292) .

## ئاییندارى لای بەساڵاچووان

هەرچەندە جیاوازی لە نێوان توێژەران هەیە سەبارەت بە دەستنیشانکردنی ئەو تەمەنەی کە پێی دەگوترێت بەساڵاچوون، یان بە زمانی ئینگلیزی (Elderly)، بەڵام بە گشتی تەمەن لە دوای شەست ساڵیەوە بە قۆناغی بەساڵاچوون دادەنرێت.

ویتبۆرن و ویتبۆرن (Whitbourne & Whitbourne, 2011:14) پێیانوایە ئایین فاکتەرێکی کاریگەرە لە بواری گەشەکردن لە قۆناغی گەورەییدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك پێویست تۆژینەوەی زانستی پێویستی لەسەر نەکراوە.

هود و هاوڕێکانی (Hood et al. 2009 ١٧٥) ئاماژە بە ئەنجامی ڕاپرسی گاڵوپ دەکەن کە نیشانی دەدات گرنگی ئایین لە شێوەیەکی ڕێك لەگەڵ زیادبوونی تەمەن، زیاتر دەبێت. بۆ نموونە کاتێك ڕێژەی ٤٧٪ لەو کەسانەی تەمەنیان لە نێوان ١٩ تا ٢٩ ساڵە پێیانوایە کە ئایین گرنگیەکی زۆری لە ژیانیانداهەیە، ڕێژەی ٧٢٪ لەو کەسانەی

تەمەنیان لە سەرووی ٦٥ ساڵە باوەڕیان بەوەیە کە ئایین زۆر گرنگە لە ژیانیاندا.

مێیسنهێلدەر و چاندلەر (Meisenhelder & Chandler ٢٠٠٢) توێژینەوەیەکیان کرد بە بەکارهێنانی روماڵی پۆست بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان ڕۆحانیەت و لەش ساغی و دەروونساغی. سامپڵی توێژینەوەکە ٢٥٠ بەساڵاچوو کە تەمەنیان لەسەرووی ٦٥ ساڵ بوو لەخۆگرت.

ئەم توێژینەوەیە بەراوردی لە نێوان دووبارەبوونەوەی نزاکردن، گرنگی بیروباوەڕ (ئیمان) لای کەسەکە، پشتبەستن بە ئایین لە پڕۆسەی هەڵکردندا و پەیوەندی بە هەشت لە جۆرەکانی تەندروستی و دەروندروستییدا ئەنجامدا.

ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە نزاکردن، بیروباوەڕ و هەڵکردنی ئایینی پەیوەندییەکی پۆزەتیڤی بەهێزیان تەنها بە دەروندروستییەوە هەیە، نەك بە حەوت جۆرەکانی دیکەی تەندروستی شیکردنەوە ئامارییەکان ئاماژەیان بەوەدا کە گرنگی بیروباوەڕ بەهێزترین پەیوەندی هەبوو لەگەڵ دەروندروستی پۆزەتیف ئەگەرچی کاریگەری هەندێ لە گۆڕاوە گرنگەکانیش کۆنترۆڵ بکرێت وەك: تەمەن و ئاستی خوێندن، ئەم توێژینەوەیە بەدەریدەخات کە لای بەساڵاچووان گرنگترین گۆڕاوە ڕۆحانییەکان کە پەیوەندی بە دەروندروستیەوە هەبێت، هەڵوێستی کەسەکەیە، نەك کردارەکانی.

سەبارەت بە ڕۆڵی ئایین لای بەساڵاچووان، هود و هاوڕێکانی (١٧٦ Hood et al. 2009:) لەو بڕوایەدان بە حوکمی تەمەنیان، بەساڵاچووان دووچاری کێشەی جەستەیی و کۆمەڵایەتی و دەروونی جیاجیا دەبنەوە، ئایینیش لە پرۆسەی خۆگونجاندن و ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشانە بە سێ ڕێگ یارمەتی بەساڵاچووان دەدات: پێدانی مانا، بەهێزکردنی هەستی کۆنترۆڵکردن، ڕێزگرتن لە خود.

نێلسن (Nelson, 2009:303) پێیوایە لە تەمەنی بەساڵاچووندا، بەساڵاچوو دەیەوێت لەگەڵ ژیانی ڕابردووی ئاشت ببێتەوە. ئایینیش، لە ڕێگای هاندانی لێخۆشبوون و لێبوردن، یارمەتی بەساڵاچوو دەدات لەم ئاشتبوونەوەیەدا، هەروەها نێلسن لەو بڕوایەدایە کە لەیەکچوونێکی زۆر لە نێوان بەساڵاچووان هەیە کە سەر بە ئایینی جیاجیان، بۆ نموونە ئاماژە بە توێژینەوەیەك دەکات کە لە نێو بەساڵاچووانی موسڵمان و مەسیحی و هیندۆسی سەنگافورە کراوە، بەدیاریخستووە گشت گرووپەکان بە زۆر کردارە ڕۆحانیەکان دەکەن، وەك: نزا و نوێژ و زیکر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکانی بەساڵاچووندا، بەساڵاچووە موسڵمان و مەسیحییەکان بەشداری خواپەرستی بە کۆمەڵ دەکەن، لە کاتێکدا بەساڵاچووە هیندۆسەکان کەمتر جەخت لەسەر لایەنی ئەخلاق و ڕەوشت دەکەنەوە، بەساڵاچووە موسڵمانەکان زیاتر گرنگییان بەوە دەدا کە ببنە نموونە بۆ نەوەکانی داهاتوو.

مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو بابەت و ڕووداوانەی پەیوەندییان بە مردنەوە هەیە، بوارێکی دیکە کە وا لە هەندێ لە بەساڵاچوون دەکات زیاتر گرنگی بە ئایین و ئاییننداری بدەن، ئایینەکان بە گشتی ڕوونکردنەوەیەك پێشکەش دەکەن سەبارەت بە مردن و دوای مردن کە دڵنیاییبەخش بێت، بەساڵاچوو حاڵاتی لەدەستدانی کەسانی خۆشەویست و نزیك لە خۆی دەبینێت، هەندێ لە بەساڵاچووان ئایین بەکاردێنن وەك ئامرازێك بۆ هەڵکردن لەگەڵ ئەم دەستدانانە.

لەو بەشەی کە هەندێك لە توێژینەوەکان کورت دەکەینەوە سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئاییننداری و هەندێ کێشەی دەروونی، ئاماژە بە چەندەها توێژینەوە دەکەین کە باس لە گرنگی و ڕۆڵی ئاییننداری لە ژیانی بەساڵاچوواندا دەکەن.

وێڕای کاریگەری ئایین لەسەر دەروونساغی، هەندێ لە توێژینەوەکان باس لە کاریگەری ئاییننداری لەسەر لەشساغیش دەکەن، بۆ نموونە سەبارەت بە پەیوەندی نێوان چالاکی ئایینی تایبەت و باری جەستەیی بەساڵاچووان، هالێی و هاوڕێکانی (Haley, Koenig & Bruchett 2001) ساڵی ١٩٨٦ توێژینەوەیەکیان کرد، ژمارەی بەشداربووان گەیشتە ٣٨٥١ کەس کە تەمەنیان لەسەرووی ٦٥ ساڵ بوو، وەڵامی چەند پرسیارێکیان دابۆوە دەربارەی نزاکردن، زیکرکردن و خوێندنەوەی ئینجیل.

بە پێی ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە، ئەو کەسانەی کە ئاماژەیان بەوە کردبوو کە ڕۆژانە چالاکی ئایینی تایبەتیان کردووە و ئەوانەی هەرگیز

ئەم جۆرە چالاکییەیان نەکردووە، زیاترین ژمارەی کێشەی جەستەییان هەبوو، ئەو کەسانەی کە هەفتەی جارێك نزا، یان زیکریان کردووە، کەمترین کێشەی جەستەییان هەبووە.

توێژەران ئەم ئەنجامەیان بەوە لێکداوە کە کاتێك کێشە جەستەییەکان زیاد دەبن، چالاکییە ئایینەکانیش لە ئەنجامدا زیاد دەبن، کاتێك چالاکییە ئایینییەکان زیاد دەبن، کێشە جەستەییەکانیش زیاد دەبن.

توێژینەوەیەکی دیکە لە سەر پەیوەندی نێوان ئایین و ڕۆحانییەت و حاڵەتی تەندروستی بەساڵاچووە نەخۆشەکان لەلایەن دالێمان و پێرێرا و ستودێنسکی (Daaleman, Perera and Studenski 2004) کراوە. ئەم توێژینەوە ٢٧٧ کەسی بەساڵاچووی نەخۆشی لە شاری کەنساس گرتەخۆی و ئەنجامەکەی ئەوەی بەدیارخست ئەو کەسانەی ئاستی ڕۆحانییەتیان بەرز بوو، نەك ئاستی ئایینداریيان، زیاتر تەندروستی خۆیان بە (باش) هەڵدەسەنگاند، بۆیە توێژەران دەگەنە ئەو دەرئەنجامەی کە ڕۆحانیەت فاکتەرێکی روونکەرەوەی باشە بۆ حاڵەتی تەندروستی، وەك بەساڵاچووان گوزارشتی لێدەکەن.

**لەم بەشەدا باس لە کورتە مێژووییەك دەکەین کە مرۆڤایەتی لە مێژووی کۆندا چۆن مامەڵەی لەگەڵ نەخۆشی دەروون و نەخۆشدەروونەکان کردووە، ئینجا ئاماژە بە چەند توێژینەوە دەکەین کە پەیوەندی نێوان ئاییندارى و هەندێ کێشەی دەروونی و کۆمەڵایەتی ڕوون دەکەنەوە.**

## کورتەیەکی مێژوویی:

هەرچەندە زانیارییمان دەربارەی شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ ڕەفتاری نائاسایی لە کۆمەڵگەی کۆن و پێش مێژوودا کەمە، دیارە باب و باپیرانمان تەماشای ڕەفتاری لادەریان کردووە وەك بەرهەمی هێزێکی دوور، یان لەسەرووی سروشت، بۆ نموونە جوڵەی ئەستێرەکان، تۆڵەی خوداوەند، یان کاری جنۆکە خراپەکان (Bootzin, Acocella & Alloy, 1993:8).

دیارە مرۆڤ لە شارستانییەکانی چین و میسر و عیبرانی وگریکەکان، وەك لە نووسراوەکانیان تێبینی دەکرێت، هۆکاری ڕەفتاری نائاساییان خستۆتە پاڵ خواکان و دێو و جنۆکە کە دەچنە نێو لەشی مرۆڤ و تووشی ئەم ڕەفتارەی دەکەن (Butcher et al, 2008:10).

بابلیەکانیش لە میسۆپۆتامیا (بلاد الرافدین) هەمان ئەم بیروڕایەیان هەبووە سەبارەت بەم دیاردەیە (صالح، ٢٠٠٥: ١٧).

بوچەر و هاوڕێکانی (Butcher et al, 2008:10) ئاماژە بەوە دەکەن کە بڕیاردان لەسەر سروشتی ئەم جنۆکەیە و ئایا ئەو جنۆکەیەی کە چووەتە نێو لەشی کەسەکە جنۆکەیەکی باشە، یان خراپە؟ بەند بوو بەو نیشانانەی لەسەر بابای تووشبوو بەدیار دەکەوت، ئینجا ئەگەر رەفتار و گوفتاری کەسەکە گرنگییەکی ئایینی، یان تەسەوفی هەبووایە ئەوا خەڵك پێیوابوو ئەو جنۆکەیەی چۆتە نێو لەشی کەسەکە جنۆکەیەکی باشە، بۆیە بە ترس و ڕێزەوە تەماشای ئەم جۆرە کەسانەیان دەکرد و وایاندەزانی توانای لە سروشتبەدەریان هەیە.

دیاردەی چوونی جنۆکە بۆ ناو لەشی مرۆڤ لە زمانی ئینگلیزی پێی دەگوترێت: (Possession) وبە زمانی عەرەبیش پێی دەگوترێت (تلبس) لە کوردیش هەندێکجار دەڵێن جنۆکەی دەستی لێ وەشاندووە، بەڵام زۆربەی حاڵەتەکانی "تلبس" وا تەماشای دەکرا کە بە هۆی خوایەکی توڕە یان گیانێکی خراپ دروست بووە بە تایبەتی کاتێك مرۆڤە زیاد لە پێویست چالاك بووایە و هەندێك رەفتاری بکردبایە کە پێچەوانەی ئایین بووایە. لای جولەکەکان "تلبس" یان دەستوەشانی جنۆکە مانای تووڕەیی وتۆڵەی خودایە. لە تەوراتدا هاتووە کە پێغەمبەر موسا، سەلامی خوای لێبێت، گوتوویەتی: "خودا تووشی شێتیتان دەکات". هەروەها لە ئینجلیشدا هاتووە کە پێغەمبەر عیسا، سەلامی خوای لێبێت، پیاوێکی چاککردۆتەوە کە "گیانێکی پیس"ی هەبووە وپاش ئەوەی ئەو شەیتانانەی (جنۆکانەی) کە تووشی ببوون

گوێزرانەوە بۆ ناو مێگەلە بەرازێك كە "بە توووندی لە بەرزایەکەوە خۆیان فڕێدا ناو ڕووبار" (Butcher et al, 2008:11).

ئەگەر هۆی نەخۆشی دەروونی، یان ڕەفتاری نائاسایی، چوونی جنۆکە بێت بۆ نێو لەش، ئەوا شتێکی مەنتقییە کە چارەسەری ئەم جۆرە نەخۆشییە دەرکردنی جنۆکەیە لەم لەشە، چ بە خۆشی بێت، چ بە ناخۆشی، پرۆسەی دەرکردنی جنۆکە لە لەشی مرۆڤ بە زمانی ئینگلیزی پێی دەگوترێت (Exorcism). بوتزین و هاوڕێکانی (Bootzin et al, 1993: 6) ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم کردارە چەند تەکنیکێکی لەخۆدەگرت، هەندێکیان نەرم و ئاسان بوون، هەندێکی دیکەیان توووند و دڕندانە بوون، لە هەندێك حاڵەتدا دوعاکردن و ژاوەژاو دروستکردن و خواردنەوەی ماددەی تایبەتی بەس بوو بۆ دەرکردنی جنۆکەکە لە لەشی مرۆڤ، بەڵام ئەگەر جنۆکەکە کەللەڕەق بووایە و بە شێوازی نەرم دەرنەچووبایە دەرەوە، ئەوا شێوازی توندی لەگەڵ بەکاردەهێنرا، بۆ نموونە کەسەکە لە ئاو نقوم دەکرا، یان دارکاری دەکرا، یان برسی دەکرا بە مەبەستی ئەوەی شوێنی جنۆکەکە، کە لەشی مرۆڤەکەیە، ناڕەحەت بێت، بەڵکو لێی دەربچێت.

لە هەندێك حاڵەتی دیکەدا کەللەی سەری کەسەکە کون دەکرا بۆ ئەوەی جنۆکەکە لێیەوە دەربچێتە دەرەوە، ئەم کردارەش پێی دەگوترا: Trephining (Sarason & Sarason, 1996: 35 ).

لە هەندێك لە کۆمەڵگا کۆنەکان، (شامان) کە کاری پزیشکی و سیحری دەکرد، ڕۆڵی ناوبژیکەری لە نێوان کەسە نەخۆشەکە و ئەو

گیانە پیسەی کە چووەتە نێو لەشی نەخۆشەکە دەبینی و خەڵك بڕوایان وابوو کە (شامان) دەتوانێت گفتوگۆ لەگەڵ گیانە پیسەکە بکات و لە ڕێگای سروتی دیارییکراودا لە لەشی کەسەکە بیهێنێتە دەرەوە .(Sarason & Sarason, 1996: 34)

لە یۆناندا، هیپۆکراتس هەوڵیدا کە هۆکاری تووشبوون بە نەخۆشیە دەروونییەکان بگەڕێنێتەوە بۆ هۆکاری بایۆلۆجی، ئەم بۆچوونەشی کاریگەری باشی هەبوو لەسەر ڕۆمانەکان و پزیشکە موسڵمانەکانیش، بەڵام لە سەدەکانی ناوەڕاست، ئەوروپا دووبارە پەنای بردە بەر لێکدانەوەی ناسروشتی، بە تایبەتی ڕۆڵی جنۆکە، یان گیانی پیس، لە تووشبوون بە نەخۆشیە دەروونییەکاندا، بەڵام لە سەدەی بیستەمەوە ئەم بیرۆکەیە تا ڕاددەیەکی زۆر لە ئەوروپا نەما.

## ئایینداری و کێشە دەروونییەکان:

لێرەدا هەوڵ دەدەم بە کورتی ئاماژە بەو توێژینەوانە بکەم، کە توانیم دەستم بکەوێت، کە باس لە پەیوەندی نێوان ئایینداری و هەندێ کێشەی دەروونی وەك خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و فشاری دەروونی، دەکەن. هەوڵمداوە تەنها ئەو توێژینەوانە وەربگرم کە تا ڕاددەیەك تازەن، واتە لە دوای ساڵی ٢٠٠٠ بڵاوکراونەوتەوە، هەروەها هەوڵ دەدەم تەنها ئەو توێژینەوانە وەربگرم کە بە زمانی ئینگلیزی نووسراون و لە گۆڤارە زانستییەکاندا بڵاوکراونەوتەوە.

## ئاییینداری و خەمۆکی:

خەمۆکی (Depression)حاڵەتێکی دەروونییە کە کەسەکە هەست بە خەم و بێزاری دەکات و چێژ لە هیچ شتێك لە ژیانیدا وەرناگرێت، خەمۆکی نیشانەی دیکەیشی هەن و لەوانەشە ئاستی بەرز ببێتەوە و ببێتە نەخۆشی دەروونی کە لە ژێر چەتری نەخۆشییەکانی میزاج، یان (Mood Disoreders)دادەنرێت.

لە خوارەوە کورتەی ١١ توێژینەوە باس دەکەین کە لەسەر پەیوەندی نێوان ئاییینداری و خەمۆکی لای گرووپە جیاجیاکان، چ لە ڕووی ئایینەوە و چ لە ڕووی تەمەن و ڕەگەزەوە، ئەنجامدراوە.

لۆوێنتال و سینیرێلا و ئێڤدۆکا و مێرفی ( Loewenthal, Cinnirella, Evdoka & Murphy, 2001) توێژینەوەیەکیان لەسەر ڕاو بۆچوونی چەند گرووپێکی جیاجیا لە رووی کەلتووری و ئایینیەوە لە شانیشینە یەکگرتووەکان سەبارەت بە ڕۆڵی فاکتەرە ئایینیەکان لە خۆگونجاندن لەگەڵ خەمۆکی کرد. ٢٨٢ کەس بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد کە ناوەندی تەمنیان ٢٥ ساڵ بوو و سەر بە ئایینی مەسیحی و هیندۆسی و جولەکە و ئیسلام و ئایینەکانی تر بوون و هەندێکی دیکەیشیان هیچ ئایینێکیان نەبوو. ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە دەریخست چالاکی ئایینی یارمەتیدەر نەبوو لە خۆگونجاندن لەگەڵ خەمۆکی، بەڵام لە نێو چالاکیە ئایینیەکاندا، باوەڕ و دوعا کاریگەریترینیان بوون لە گونجاندن لەگەڵ خەمۆکیدا،

موسڵمانەکان، زیاتر لە گشت گرووپەکانی دیکە، بڕوایان بەوە بوو کە ڕێگاکانی هەڵکردنی ئایینی کاریگەرییان هەیە لەسەر خەمۆکی.

هەر سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئاییندارى و دەروونساغی لای بەساڵاچووان، پارکەر و هاوڕێکانی (Parker et al 2003) توێژینەوەیەکیان لەسەر ١٠٠٠ کەسدا کە تەمەنیان لەسەرووی ٦٥ ساڵ بوو ئەنجامدا.

لەم توێژینەوەیەدا سێ جۆر پێوەر بۆ پێوانی ئاستی ئاییندارى بەکارهات: ئاییندارى ڕێکخراو، ئاییندارى ناڕێکخراو، ئایین وەك ئامانج. مەبەستی توێژەرەکان دۆزینەوەی کاریگەری ئاییندارى بوو لەسەر خەمۆکی و دەروونساغی گشتی.

ئەنجامی توێژینەوەکە بەدیاریخست کە ئەوانەی ئاستیان ئاییندارییان بەرز بوو لەسەر هەر سێ پێوەر، نیشانەکانی خەمۆکیان کەمتر بوو بە بەراورد بەو کەسانەی کە ئاستی ئاییندارییان نزم بوو لەسەر ئەم پێوەرانە، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی، تەنها ئەو کەسانەی ئاستی ئاییندارى ڕێکخراویان بەرز بوو ئاستی خەمۆکیان نزم بوو. ئەوانەی ئاستی ئاییندارییان لەسەر ڕەهەندی ئاییندارى ناڕێکخراو، یان ئایین وەك ئامانج بەرز بوو، ئاستی خەمۆکی و دەروونساغییان نزم نەبوو.

سمیس و ماککلۆ و پۆل (Smith, McCullough & Poll, 2003) هەڵسان بە شیکردنەوەی ١٤٧ لێکۆڵینەوە کە لەسەر پەیوەندی نێوان ئاییندارى و خەمۆکی ئەنجامدرابوو کە کۆی ژمارەی ئەو کەسانەی لەم لێکۆڵینەوانە بەشدارییان کردبوو گەیشتە (٩٨٩٧٥) کەس، هەموو

لێکۆڵینەوەکان ئاماژەیان بەوە کرد کە بەرزی ئاستی ئایینداری پەیوەندیەکی مامناوەندی لەگەڵ کەمی نیشانەکانی خەمۆکی هەیە، هەروەها هیچ لە گۆڕاوەکانی ڕەگەز، یان تەمەن، یان ڕەچەڵەك کاریگەرییان لەسەر ئەم پەیوەندییە نەبوو، بەڵام پەیوەندی نێوان ئایینداری و خەمۆکی لەو توێژینەوانە بەهێزتر بوو کە لەسەر ئەو کەسانە ئەنجامدرابوو کە بە هۆی ڕووداوەکانی ژیانی ئێستایان، ڕووبەڕووی فشاری دەروونی بوونەتەوە، هەروەها چۆنیەتی پێوانی ئایینداری کاریگەری هەبوو لەسەر پەیوەندی نێوان خەمۆکی و ئایینداری، پێوەری ئایینداری وەك ئامراز و شێوازی هەڵکردنی ئایینی نێگەتیڤ (بۆ نموونە لۆمەکردنی خودا لە کاتی ناخۆشیدا) پەیوەندی هەبوو بە ئاستی بەرزی نیشانەکانی خەمۆکی.

ئێلیاسن و تایلەر و لۆید (Eliassen, Taylor & Lloyd, 2005) توێژینەوەیان لەسەر پەیوەندی نێوان ئایینداری و خەمۆکی لای گەنجان کرد، ژمارەی ئەو کەسانەی بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد ١٨٠٣ کەس بوون کە لە نێوان ساڵی ١٩٩٧ تا ساڵی ٢٠٠٠ لە ئەمەریکا چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کرابوو.

ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە دەریخست ئەو کەسانەی ئاستی ئاینداریی‌یان مامناوەندییە، ئاستی خەمۆکیان بەرزترە بە بەراورد بەو کەسانەی ئاستی ئایینداریی‌یان بەرزە، یان ئایینندار نیین، بەڵام ئەم جۆرە پەیوەندییە تەنها لای ئافرەتان تێبینی کرا! بە بۆچوونی توێژەران، فاکتەری پایەی کۆمەڵایەتی ئابووری و پاڵپشتی کۆمەڵایەتی،

دەکەونە نێوان ئاییینداری و خەمۆکی، هەروەها توێژەران دەگەنە ئەو دەرەنجامەی کە هەرچەندە بەکارهێنانی ئایین بۆ هەڵکردن ئاستی ناڕەحەتی کەم دەکاتەوە، ڕووبەڕووبوونەوەی زۆری زەبر دەبێتە هۆی ئەوەی کەسەکان زیاتر پەنا بۆ نزاکردن ببەن بە بەراورد بەو کەسانەی ئاستی ئاییندارییان نزمە.

ئەندرسن و هاوڕێکانی (Anderson, Marwit, Vandenberg & Chibnall, 2005) توێژینەوەیەکیان کرد لەسەر پەیوەندی سێ جۆر لە هەڵکردنی دەروونی کە بریتی بوون لە: هەڵکردنی کرداری، هەڵکردنی سۆزداری، خۆدوورخستنەوە) و دوو جۆر لە هەڵکردنی ئایینی کە بریتی بوون لە: (هەڵکردنی پۆزەتیڤ و هەڵکردنی نێگەتیڤ) و کاریگەرییان لەسەر خەم لای ٥٧ دایك کە منداڵەکانیان بە هۆی مردنی لەناکاو لەدەستدابوو. ئەو ئەنجامەی کە پەیوەندی بە ئاییندارییەوە هەبوو ئاماژەی بەوەدا کە تێکەڵکردنی شێوازی هەڵکردنی کرداری لەگەڵ شێوازی هەڵکردنی ئایینی پۆزەتیڤ پەیوەندی هەیە بە کەمی خەم، کە ئەم دایکانە دەریاندەبڕی.

خان و واتسن (Khan & Watson, 2006) لە توێژینەوەیەکدا هەوڵی دروستکردنی پێوەرێکیاندا بۆ شێوازەکانی هەڵکردنی ئایینی لای خەلکی پاکستان، هەروەها ویستیان بزانن ئەم جۆرە هەڵکردنە لای خوێندکارانی موسڵمانی زانکۆ پەیوەندی بە کاردنەوە بۆ فشار هەیە؟ ١٢٩ خوێندکار بەشدارییان لەم توێژینەوەیەدا کرد و ئەنجامەکەشی

بەدیاریخست کە پەیوەندییەکی نێگەتیڤ لە نێوان پاڵنەر و حەز کردن لە ئایین لەگەڵ خەمۆکیدا هەیە.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئاییندار و خەمۆکی لای بەساڵاچووی پەنابەر و ناپەنابەر لە لوبنان، چایە و سیبای و فەیاد و رۆهیب (Chaaya, Sibai, Fayad and El-Roueiheb 2007) توێژینەوەیەکیان کرد، ٧٤٠ کەس کە تەمەنیان لە ٦٠ ساڵ زیاتر بوو لە ناوچە هەژارەکانی لوبنان و کامپی پەنابەرە فەلەستینییەکاندا بەشدارییان لەم توێژینەوەیەدا کرد.

ئەنجامی توێژینەوەکە بەدیاریخست کە ڕێژەی بڵاوبوونەوەی خەمۆکی لای بەساڵاچووان ٢٤٪ ەو ڕێژەکە لای پەنابەرە فەڵەستینییەکان بەرزترەو (٣١٪)ە، هەروەها ئەنجامەکان دەریانخست کە تەنها ئاییندار ڕێکخراو پەیوەندی بە خەمۆکیەوە هەبوو لای پەنابەران.

سەبارەت بە کاریگەری بیروباوەڕی ئایینی لەسەر خەمی دوای لە دەستدانی کۆرپەلە، کۆوچۆك و هاوڕێکانی (Cowchock, Lasker, Toedter, Skumanich & Koenig 2009) توێژینەوەیەکیان لەسەر ١٠٣ ئافرەت کرد دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر لەدەستدانی کۆرپەلەیان، هیچ کام لە جۆری ئاییندار، هەڵکردنی ئایینی پۆزەتیڤ و دووبارەبوونەوەی چوون بۆ چالاکیە ئایینیەکان توانای پێشبینی ئاستی خەمی دایکە کۆرپەلە لەدەستداوەکانیان نەبوو، هەبوونی کێشەی ئایینی و هەڵکردنی ئایینی نێگەتیڤ و بەردەوامی وابەستەیی لەگەڵ کۆرپەلەکە پەیوەندییان بە توند خەمی دایکەکان هەبوو.

پێرێز و لیتل و هێنریك (Perez, Little & Henrich, 2009) توێژینەوەیەکی درێژمەودایان لەسەر پەیوەندی نێوان ڕۆحانیەت و نیشانەکانی خەمۆکی لای خوێندکارانی هەرزەکار کرد. ئامانجی توێژینەوەکەیان دۆزینەوەی ڕۆڵی باوەری کەسی و هەڵکردنی ڕاستەوخۆ لە پەیوەندی نێوان ڕۆحانیەت و نیشانەکانی خەمۆکی لای خوێندکارانی هەرزەکار. وێڕای ئەوەش، توێژینەوەکە هەوڵی ئەوەی دا کە ڕۆڵی رەگەز و ڕەچەلەك و قۆناغی خوێندن لەم پەیوەندییە بەدیار بخات، سامپڵی توێژینەوەکە بریتی بوو لە ١٠٩٦ خوێندکار لە پۆلی شەش تا نۆ لە قوتابخانەکانی حکومی باکووری رۆژهەڵات، لە سێ کاتی جیادا پرۆسەی پێوانی جێبەجێ کرا، لە سەرەتای توێژینەوەکە baseline و جاری دووەم دوای شەش مانگ و جاری سێیەم دوای ساڵێك.

یەکێك لە ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە ئەوە بوو کە ڕۆحانیەت کاریگەریەکی ناڕاستەخۆی لەسەر نیشانەکانی خەمۆکی تەنها لای کچان هەیە و توێژەران گەیشتنە ئەو دەرەنجامەش کە ڕۆحانیەت لەوانەیە ئاستی خەمۆکی لای کچانی هەرزەکار کەم بکاتەوە.

دیو و هاوڕێکانی (Dew, Daniel, Goldston, McCall, Kuchibhatla, Schleifer, Triplett & Koenig 2010) توێژینەوەیەکیان کرد بۆ دۆزینەوەی ئەو میکانیزمانەی کە لە ڕێگایەوە ئایین کاریگەری دەکاتە سەر خەمۆکی لای هەندێ لە هەرزەکاران کە تووشی نەخۆشی دەروونی بوون. سامپڵی توێژینەوەکە ١٤٥ هەرزەکاری گرتەوە کە تەمەنیان لە نێوان ١٢ تا ١٨ ساڵ بوو کە وەڵامی

ڕاپرسییەکانی توێژینەوەکەیان داوە و پاش شەش مانگ بۆ جاری دووەم وەڵامی ڕاپرسیەکانیان داوە. پێوەری ئاییندارى/ ڕۆحانیەت ١٣ ڕەهەندی تیابوو، نۆیان پەیوەندیەکی پێچەوانەی بەهێزیان لەگەڵ ئاستی خەمۆکی هەبوو کە بریتیبوون لە: ئەزموونی ڕۆحیی ڕۆژانە، لێبوردەیی، خۆگونجاندنی ئایینی پۆزەتیڤ، پاڵپشتی ئایینی پۆزەتیڤ، ئاییندارى لە چوارچێوەی دامەزراوەیی، وەسفی خود وەك ئاییندار/ ڕۆحانی. دوو لە ڕەهەندەکان پەیوەندی پۆزەتیڤیان بە خەمۆکی هەبوو کە بریتیبوون لە: خۆگونجاندنی ئایینی نێگەتیڤ، پاڵپشتی نێگەتیڤ، هەروەها یەکێکی دیکە لە ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە ئەوە بوو کە لەدەستدانی باوەڕ فاکتەرێکی پێشبینیکەر بوو بۆ چاکنەبوونەوەی خەمۆکی پاش تێپەڕبوونی شەش مانگ.

پێسێلۆ و هاوڕێکانی (Peselow, Pi, , Lopez, Besada, & Ishak 2014)توێژینەوەیەکیان بۆ زانینی کاریگەری ڕۆحانیەت لەسەر نەخۆشی خەمۆکی گەورە ئەنجامدا، ٨٤ نەخۆش بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد و وەڵامی چوار ڕاپرسییان دایەوە کە پەیوەندییان بە خەمۆکی و بێئومێدی و هەڵوێستی نادروست و ڕۆحانیەتەوە هەبوو.

ئەنجامەکان دەریانخست کە ئەو نەخۆشانەی لەسەرەتادا ئاستی ڕۆحانیەتیان بەرزبوو، نیشانەکانی خەمۆکی و بێئومێدی و هەڵوێستی نادروستیان کەمتر بوو، ئەو نەخۆشانەی بڕوایان بە خوا هەبوو زیاترین گۆڕانیان لەسەر ئاستی خەمۆکی و بێ ئومێدی و هەڵوێستی نادروست لەسەر دیار بوو.

## ئاییندارى و دڵەڕاوكێ

به كورتى دڵەڕاوكێ (Anxiety)برتییه له جۆرێك له ترس كه سەرچاوەكەی ڕوون نییه. لێرەدا كورتەی شەش توێژینەوە دەخەینەڕوو كه لەسەر پەیوەندی نێوان ئاییندارى و دڵەڕاوكێ كراوە به شێوەیەكى تایبەتی. هاریس و شۆنمان و كارێرا (Harris, Schoneman, & Carrera, 200)لە توێژینەوەیەكدا هەوڵیاندا پەیوەندی نێوان ئاییندارى و دڵەڕاوكێ له نێو خوێندكارانی زانكۆ بدۆزنەوە، سامپڵی توێژینەوەكه له ٨٥ خوێندكاری زانكۆی ئەمەریكی پێكهات.

ئەنجامەكان دەریانخست كه كۆمەڵێك گۆڕاوی ئایینی، وەك پابەندبوونی ئایینی و نزاكردن و پەیوەندییكردن به كەسانی ئاییندار، پەیوەندییەكی نێگەتیڤیان به خاسیەتی دڵەڕاوكێ (trait anxiety) هەبوو، توێژەران دەگەنه ئەو دەرەنجامەی كه ئاییندارى پەیوەندی به نزمی ئاستی دڵەڕاوكێ گشتی هەیە. ئاردێلت (Ardelt 2003) توێژینەوەیەكی لەسەر كاریگەری ئایین و ئامانجی ژیان لەسەر تەندورستی بەساڵاچووان و هەڵوێستیان بەرانبەر مردن كرد، ١٠٣ كەسی بەساڵاچوو (كه تەمەنیان لەسەرووی ٥٨ ساڵ بوو) بەشدارییان لەم توێژینەوەیه كرد.

ئەنجامی توێژینەوەكه بەدیاریخست كه ئامانج له ژیان، نەك شێوازی ئاییندارى چ ناوەكی چ دەرەكی، پەیوەندی پۆزەتیڤی به تەندروستی بەساڵاچووان هەبووە و پەیوەندییەكی نێگەتیڤی لەگەڵ ترس له مردن و خۆدوورخستنەوە لێی، هەبوو، هەروەها ئەنجامەكان دەریانخست كه ئاڕاستەی ئاییندارى دەرەكی پەیوەندی پۆزەتیڤ لەگەڵ ترس له مردن

و خۆدوورخستنەوە لێی هەبوو، واتە هەرچەندە کەسەکە لەم جۆرە ئاڕاستەی ئاییندارییە بەهێزتر بێت، ترسی لە مردن زیاتر دەبێت و زیاتر هەوڵ دەدات خۆی لێ دووربخاتەوە، بەڵام ئاڕاستەی ئاییندار ناوەکی پەیوەندییەکی پۆزەتیڤی بە قبوڵکردنی مردن هەبوو، بەشدارییکردن لە چالاکییە ڕۆحییەکان و ئینتیما بۆ ئایین پەیوەندییان بە تەندروستی نەبوو، بەلکو پەیوەندی پۆزەتیڤیان بە خۆدوورخستنەوە لە مردن و ترس لە مردن هەبوو.

توێژینەوەکەی هاردینگ و هاوڕێکانی (Harding, Flannelly, Weaver & Costa, 2005) دەربارەی کاریگەری ئایین لەسەر دڵەڕاوکێی مردن و قبوڵی مردن کرد، ژمارەی ئەو کەسانەی کە بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد ١٣٠ کەس بوون کە ئەندام بوون لە کەنیسەدا لە شاری نیۆیۆرك. ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە هەندێ رەهەندی ئاییندار پەیوەندی بە دڵەڕاوکێی مردن و قبوڵکردنی مردن هەبوو، باوەڕ بە بوونی خودا و باوەڕ بە رۆژی دوایی لەلایەك پەیوەندی نێگەتیڤیان بە دڵەڕاوکێی مردن هەبوو، لە لایەکی دیکەوە پەیوەندی پۆزەتیڤیان بە قبوڵکردنی مردن هەبوو.

کالخۆران و کەریموڵڵاهی (Kalkhoran & Karimollahi, 2007) توێژینەوەیەکیان لە ئێراندا کرد لەسەر پەیوەندی نێوان ئاییندار و دڵەڕاوکێی پێش نەشتەرگەری، سامپڵی ئەم توێژینەوەیە لە ١٥٠ نەخۆش پێکهات کە چاوەڕوانی نەشتەرگەری جیاجیا بوون. زانیاریەکان

لە ڕێگای دوو ڕاپرسی کۆکرانەوە: یەکەمیان بۆ پێوانی ئاستی دڵەڕاوکێ بوو، ئەوی دیکەیان بۆ پێوانی ئاستی ئاییینداری بوو.

ئەنجامەکان بەدیاریانخست کە زۆربەی زۆری نەخۆشەکان ئاستی ئاییندارییان بەرز بوو و ئاستی دڵەڕاوکێیان مامناوەند، هەروەها پەیوەندییەکی پێچەوانە بەدی کرا لە نێوان ئاییینداری و توندی دڵەڕاوکێ، بەڵام ئەم پەیوەندییە لە ڕووی ئامارەوە بەڵگەدار نەبوو.

مەحمودی و عەبادی و ئەکبەرزادە (Mahmoudi, Ebadi & Akbarzadeh, 2007)توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی نێوان هەڵکردنی ئایینی و ئاستی دڵەڕاوکێ لای خوێندکارانی زانکۆی ئازادی ئیسلامی لە نێوان ساڵانی ١٩٩٩ تا ٢٠٠٠ کرد، ٣١٦ خوێندکاری زانکۆ زانیارییان پێشکەش کرد بە پڕکردنەوەی دوو ڕاپرسی: یەکێکیان بۆ پێوانی هەڵکردنی ئایینی و ئەوی دیکەیان بۆ پێوانی دڵەڕاوکێ بوو.

ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە زیاتر لە ٨٥٪ لە بەشداربووان بە شێوەیەکی مامناوەند هەڵکردنی ئایینی بەکاردەهێنن، هەروەها پەیوەندییەکی بەڵگەدار لە نێوان هەڵکردنی ئایینی و ئاستی دڵەڕاوکێ دۆزرایەوە، ئەو کەسانەی کە بە کەمی هەڵکردنی ئایینی بەکاردێنن، ئاستی دڵەڕاوکێیان توند بوو.

چوین و چوو (Chuin & Choo, n. d. ) توێژینەوەیەکیان لەسەر کاریگەری ئایین و ئاڕاستەی ئایینی و ڕەگەز و تەمەن لەسەر دڵەڕاوکێی مردن لە مالیزیادا ئەنجامدا، ٣٢٠ کەس بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد کە تەمەنیان لە نێوان ١٧ تا ٧٠ ساڵ بوو.

ئەنجامی توێژینەوەکە هیچ پەیوەندییەکیان بەدی نەکرد لە نێوان ئاڕاستەی ئایینی و ئاستی دڵەڕاوکێی مردن، بەڵام ئافرەتان ئاستی دڵەڕاوکێی مردنیان نزمتربوو و هیچ جیاوازییەك لە نێوان گرووپەکانی تەمەن و ئەم جۆرە دڵەڕاوکێیە تێبینی نەکرا.

## ئایینداری و دڵەڕاوکێ و خەمۆکی:

هەندێ لە توێژینەوەکان هەوڵیانداوە پەیوەندی نێوان ئایینداری و دڵەڕاوکێ و خەمۆکی بەیەکەوە بدۆزنەوە، لە خوارەوە ئاماژە بە یەکێك لەم توێژینەوانە و ئەنجامەکانی دەکەم.

لە توێژینەوەیەکی ئەزموونی و بۆ زانینی کاریگەری جۆرێك لە چارەسەری دەروونی کە لەسەر بنەمای ڕۆحانی دامەزرابێت، لەسەر دابەزاندنی ئاستی دڵەڕاوکێ و خەمۆکی لای بەساڵاچووان، راجاگۆپال و هاوڕێکانی (Rajagopal, Mackenzie, Bailey, and Mourey, 2002) بیستودوو کەسی بەساڵاچوویان لە خانەکانی بەساڵاچووان کردە سامپڵی توێژینەوەکە کە هەموویان دەستیشانکرابوون کە تووشی خەمۆکی سووك بوون. لە ئەنجامی چارەسەرەکە، ئاستی دڵەڕاوکێ بە شێوەیەکی مانادار و بەرچاو نزم بووەوە، هەروەها ئاڕاستەیەکیش بەدی کرا لە نزمبوونەوەی ئاستی خەمۆکی لای بەشداران، ئەوانەی کە بەردەوامبوون لەسەر بەکارهێنانی ستراتیجیەتی بازنەی نزا، ئاستی خەمۆکییان نزم بووەوە، بەڵام ئەوانەی ئەم ستراتیجیەتەیان بەکارنەهێنا، ئاستی خەمۆکیان زیادی کرد.

## ئاییندارى و فشارى دەروونى:

زۆربەی زۆری پسپۆڕانی دەروونی لەسەر ئەوە کۆکن کە سەردەمی ئێستامان، سەردەمی فشاری دەروونییە (Psychological stress)، هەروەها ئەم پسپۆڕانە کۆکن لەسەر ئەوەی کە فشاری دەروونی نەك تەنها کاریگەری لەسەر دەروون ورەفتارمان هەیە، بەڵکو کاریگەری مەترسیداری لەسەر تەندروستی جەستەییشمان هەیە بە تایبەتی تووش بوون بە نەخۆشیەکانی دڵ، بۆیە توێژینەوەیەکی زۆر لەسەر بابەتی فشاری دەروونی کراوە، بە تایبەتی لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا.

لە خوارەوە ئاماژە بە پێنج لە توێژینەوەکان دەکەم کە باس لە پەیوەندی نێوان ئاییندارى و فشاری دەروونی دەکەن.

لۆولەر و یانگەر (Lawler & Younger 2002) توێژینەوەیەکیان لەسەر ٨٠ کەس کرد کە تەمەنیان لە نێوان ٢٧ـ٦٠ ساڵ بوو، بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان ڕۆحانیەت و ئاییندار لەگەڵ کاردانەوەی توندی دڵ (Acute Cardiovascular Response) و نیشانە جەستەییەکانی نەخۆشی، و فشار و میزاج، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەندامانی سامپڵەکە کرا و پاڵەپەستۆی خوێن و لێدانی دڵیان چاودێری کرا.

ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە پەیوەندی لە نێوان ئینتیمای ئایینی و دووبارەبوونەوەی ئامادەبوون لە چالاکییە ئایینی و سرووتەکان لەگەڵ لێدانی دڵ لە کاتی پشوو (إستراحە) (Diastolic Resting) و پاڵەپەستۆی خوێن لە خوێنبەرەکاندا هەیە (Arterial Pressure).

ڕۆحانیەت، بە تایبەتی لە لایەنە وجودییەکەیەوە، پەیوەندی هەبوو بە نیشانەکانی نەخۆشی، بەکارهێنانی دەرمان، فشار و حاڵەتی میزاجی ناخۆش، ڕۆحانیەت و بەشداری لە چالاکییە ئایینیە رێکخراوەکان بە یەکەوە لەوانەیە هۆیەك بن بۆ زیادکردنی هەستکردن بە ئامانج و مانا لە ژیاندا، ئەمەش لەلای خۆیەوە، پەیوەندی بە نەرمی و بەرهەڵستی زیاتر هەیە بەرانبەر بەو نەخۆشیانەی کە پەیوەندییان بە فشاری دەروونییەوە هەیە.

کارلۆزی و هاوڕێکانی (Carlozzi, et al 2010) توێژینەوەیەکیان لەسەر ٥٣ کەس کرد لە سەرەتای قۆناغی هەرزەکاریدا کە تەمەنیان لە نێوان ١٣ تا ١٥ ساڵ بوو، مەبەست لەم توێژینەوەیە دۆزینەوەی پەیوەندی بوو لە نێوان بیروباوەڕو چالاکی ڕۆحی لەگەڵ تووڕەبوون و فشار.

ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە پەیوەندیەکی پۆزەتیڤ هەیە لە نێوان ئەم گۆڕاوانەدا، واتە ئەو هەرزەکارانەی ئاستی بیروباوەڕ و چالاکی ڕۆحیان بەرز بوو، لەهەمانکاتدا ئاستی تووڕەبوون و فشاریشیان بەرز بوو.

سێ توێژەر (Ferguson, Willemsen & Castaneto 2010) توێژینەوەیەکیان لەسەر کاریگەری نزا (دوعاکردن) لە مەسیحیەتدا لەسەر تەندروستی کرد، ١١٥ مەسیحی کاسۆلیك بەشدارییان لە توێژینەوەکە کرد. پرۆگرامی (بەچەقکردنی نزا) بەم شێوەیە بوو: دانیشتنی بە کۆمەڵ بۆ ماوەی دوو کاتژمێر و پراکتیزەکردنی نزا بە تاك

دوو جار لە ڕۆژێکدا و بۆ ماوەی ١٠ هەفتە، گریمانی ئەم توێژینەوەیە ئەوە بوو کە نزاکردن فشاری بەشداربووان کەمدەکاتەوە و پەیوەندی (هاوکارییان) لەگەڵ خودا بەهێزتر دەکات. زانیارییە چەندی وچۆنییەکانی توێژینەوە پاڵپشتی لەم گریمانە کرد و بەدیاریخست کە نزا کردن فشاری دەروونی کەمدەکاتەوە.

گرووپێك لە توێژەران (Belding, Howard, McGuire, Wilson & Schwartz 2010) هەوڵیاندا بزانن ئایا بڕوا بە بوونی زاتێك (خودا) پاڵپشتی بکات، دەبێتە هۆی نزمکردنەوەی فشاری توند؟ سامپڵی ئەم توێژینەوەیە لە ١١١ خوێندکاری زانکۆ پێکهات کە لەسەر سێ گرووپ لە شێوەیەکی هەرەمەکی دابەشکران: گرووپی دوعا، گرووپی هاندنی خود بە قسە و گرووپی کۆنترۆڵ، هەر سێ گرووپیش ڕووبەڕووی فشار کرانەوە، ئاستی فشار، بە پێی دەربرینی کەسەکە، لای گرووپی دوعا و هاندنی خود بە قسە نزمتر بوو بە بەراورد بە گرووپی کۆنترۆڵ، کە نە دوعایان دەکرد و نە بە قسە هانی خودی خۆیان دەدا. هەردوو جۆری پاڵەپەستۆی خوێن (Systolic & Diastolic) تەنها لای گرووپی دوعا نزمتر بوو بە بەراورد بە گرووپی کۆنترۆڵ، بەڵام جیاوازی نێوان گرووپی دوعا و گرووپی هاندانی خود بە قسە نەبوو.

توێژینەوەکە ئەوەی دەرخست کە نزا بە تەنها فشار کەم ناکاتەوە و لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت بە بۆچوونی توێژەران کە زۆربەی خوێندکاران لە گرووپی نزا خوێندنەوەی نزایان بە نزا حیساب نەکردبووبێت.

لابیَ و فۆبێس (Labbe & Fobes 2010) لە توێژینەوەیەکدا هەوڵیاندا پەیوەندی نێوان ڕۆحانیەت و جۆری کەسایەتی و فشاری دەروونی بزانن، گریمانی توێژینەوەکە ئەوە بوو کە ئەو گەنجانەی ئاستی ڕۆحانیەتیان بەرزە، ئاستی و وروژانی کۆئەندامی دەماری سیمپاویان نزمە و باشتر دەتوانن لە رووی سۆزەوە لەگەڵ سەرچاوەکانی فشار هەڵ بکەن بە بەراورد بەو کەسانەی کە ئاستی ڕۆحانیەتیان نزمە، ئەو گرووپانەی کە ئاستی جیاجیایان لە ڕۆحانیەتدا هەبوو، لەگەڵ یەکتردا بەراوردکران لە بواری سیفەتی تووڕەبوون، نیۆرۆتیسیزم، ویژدانزیندوویی، ئێکستراڤێرشن، رازیبوون و کراوەیی بۆ ئەزموونی نویَ، ٨٠ خوێندکاری زانکۆ کە تەمەنیان لەسەرووی ١٨ساڵ بوو بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد.

کاردانەوەی فسیۆلۆجی بەشداربووان پێش رووداوی فشاردار و دوای رووداوەکە چاودێری کرا، لە ئەنجامدا جیاوازییەکی مانادار لە نێوان رێژەی ئارەقەکردن و کاردانەوەی سۆزداری بۆ سەرچاوەی فشار لە نێو ئەو گرووپانەی کە ئاستی جیاوازیان لە ڕۆحانیەت هەبوو، تێبینی کرا ئەوانەی ئاستی ڕۆحانیەتیان بەرز بوو، رێژەی ئارەقەکردن و ئاستی تووڕەبوونیان نزمتر بوو بە بەراورد بەوانەی کە ئاستی ڕۆحانیەتیان نزم بوو.

## ئاييندارى و خۆشحاڵى دەروونى:

خۆشحاڵى دەروونى (Psychological Well-being)گۆڕاوێكى گرنگە لە دەروونزانییدا، هەندێكجار لە جیاتی دەروونساغی بەكاردەهێنرێت، لەم ساڵانەی كۆتاییدا توێژینەوەیەكی زۆر لەسەر خۆشحاڵی دەروونی كراوە، هەندێك لەم توێژینەوانە هەوڵیان داوە بزانن ئایا هیچ پەیوەندییەك لە نێوان ئاییندارى و خۆشحاڵى دەروونى هەیە، یان نا؟ لە خوارەوە كورتەی شەش لە توێژینەوەكان دەخەمە بەردەستی خوێنەر كە لەسەر ئەم بابەتە كراوە.

ئامانجی توێژینەوەكەی لۆرێنسێل و ئابێل و شوارتز (Laurencelle, Abell & Schwartz, 2002) دۆزینەوەی پەیوەندی بیروباوەڕی ئایینی لە جۆری ئایین وەك ئامانج، لەگەڵ خۆشحاڵی دەروونییدا، ژمارەی ئەو كەسانەی بەشدارییان لەم توێژینەوەیە كرد ٢١٠ كەس بوون.

ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە بەدیاریخست كە بەهێزیی بیروباوەڕ پەیوەندی هەبوو بە نزمی ئاستی دڵەڕاوكێ و خەمۆكی، ئەگەری بەدیاركەوتنی نیشانەكانی نەخۆشی كەمتر بوو، لەبەرانبەریشدا پەیوەندی هەبوو بە بەهێزیی خود بە بەراورد بەو كەسانەی كە بیروباوەڕەكەیان نزمتر بوو.

فرێیزەر و مینتز و مۆبلی (Frazier, Mintz & Mobley, 2005) توێژینەوەیەكیان بە مەبەستی دۆزینەوەی پەیوەندی لە نێوان

بەشداریکردن لە چالاکییە ئایینیەکان و خۆشحاڵی دەروونی لای ئەفریقیە ئەمەریکیە بەساڵاچووەکان لە شارەکان کرد، ٨٦ کەسی بەساڵاچوو وەڵامی دوو راپرسیان دایەوە سەبارەت بە ئاییندارى و خۆشحاڵی.

ئەنجامەکان دەریانخست کە چەند رەهەندێك لە بەشدارییکردنی ئایینی (ئاییندارى رێکخراو، ئاییندارى نارێکخراو، ئاییندارى خودی) پەیوەندی هەیە بە چەند رەهەندێکی خۆشحاڵی دەروونی کە بریتین لە: پەیوەندی باش لەگەڵ کەسانی دیکە، خود قبوڵکردن، دەستگرتن بەسەر ژینگە، مەبەستی ژیان و گەشەی کەسی.

توێژینەوەی رۆبو (Robu 2006) بۆ تاقیکردنەوەی ئەو گریمانە بوو کە ئایا جۆرێکی تایبەتی لە ئاییندارى، کە خاوەنەکەی هەست بە بوونی خودا بکات لە لایەنە جیاجیاکانی ژیاندا، ڕۆڵی کەمکردنەوەی کاریگەری وابەستەیی نائارام لەسەر خۆشحاڵی دەبینێت؟ خۆشحاڵی لەم توێژینەوەیە وا پێناسە کرا کە بریتییە لە نزمی ئاستی دڵەڕاوکێ و هێنانەدی هاوسەنگی لە نێوان هەستە خۆش و ناخۆشەکان، شوناسی خود و هەستکردنی بە مانا، سامپڵی توێژینەوەکە لە ٩٦ کەس پێکهات کە مەسیحی بوون سەر بە ئایینزای جیاجیا.

ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە جۆرێکی تایبەتی لە ئاییندارى، ئاگاداربوون لە خودا، بە بەراورد بەو جۆرە ئاییندارییەی کە لەسەر بنەمای هەڵچوون (إنفعال) دامەزراوە، کاریگەری بەسوودی هەبوو لەسەر خۆشحاڵی وجودی (هەستکردن بە بوونی مانا)، واتە دەشێ ئەم جۆرە

ئاییندارییە یارمەتی خەڵك بدات لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ کێشەکانی تر لە ژیاندا وابکات کەسەکە ژیانێکی مانادار بژییێت لە رووی وجودییەوە. وێرای ئەوەش، ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە ئاییندارى ئەوە کەسانەی کە ئاستی دڵەڕاوکێیان بەرزە لە پەیوەندییەکانیاندا، ئەم جۆرە ئاییندارییە لەسەر بنەمای هەڵچوونەوە دامەزراوە و پەیوەندییان بە خودا وەك زاتێك کە شایەنی وابەستەییەکی رەها بێت ولەسەر بنەمایەکی ئارام دامەزرابێت و سەرچاوەی دڵدانەوە بێت.

بۆسوێل و کاهانا و ئەندرسن (Boswell, Kahana & Anderson 2006) توێژینەوەیەکیان بە ناونیشانی: ڕۆحانیەت و ڕەفتارەکانی شێوازی ژیانی دروست؛ کاریگەری دژە تەنگژە لەسەر خۆشحاڵی لای بەساڵاچووان ئەنجامدا، ئامانجی توێژینەوەکە وەڵامی ئەو پرسیارە بوو: ئایا ئاییندارى و ڕۆحانیەت و رەفتارەکانی شێوازی ژیانی دروست ڕۆڵیان لە کەمکردنەوەی کاریگەری تەنگژە لای گرووپێك لە بەساڵاچووان (تەمەنیان لەسەرووی ٧٠ ساڵ بوو) کە تووشی نەخۆشی درێژخایەن بووبوون و کاریگەری ئەوەش لەسەر هەستکردنیان بە خۆشحاڵی، هەیە، ٢٢١ کەس بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد.

ئەنجامی توێژینەوەکە بەدیاریخست کە ڕۆحانیەت و چالاکی جەستەیی و خواردن دروست هۆکارن بۆ بەرزی هەستکردن بە خۆشحاڵی.

کۆلبێرت و هاوڕێکانی (Colbert, Jefferson, Gallo & Davis 2009) توێژینەوەیەکیان لەسەر ئەمەریکییە ئەفریقیەکان کرد بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان ئایینداری و خۆشحاڵی دەروونی، ٣١٥ کەسی ئەمەریکی بە ڕەگەز ئەفریقی بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد کە نیشتەجێی ناوچەی تێکساس و تێنێسی و کالیفۆرنیا بوون.

بەشێك لە ئەنجامە سەرەکییەکانی ئەم توێژینەوە ئەوە بوو کە پەیوەندی لە نێوان ئاستی ئایینداری و گۆڕاوەکانی دەروونساغیدا هەیە، ئەم گۆڕاوانەی لەم توێژینەوەدا لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردن خەمۆکی و هەڵکردن و ڕێزگرتن لە خود بوون.

ونوك و مارسینکۆوسکی (Wnuk & Marcinkowski, 2014) توێژینەوەیەکیان لەسەر ١١٥ خوێندکاری زانکۆ لە پۆڵەندا ئەنجامدا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە: ئایا گۆڕاوە بوونگەراییەکان ڕۆڵیان لە نێوان ئایینداری/ ڕۆحانیەت و خۆشحاڵی دەروونی هەیە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، ئەم دوو توێژەرە هەڵسان بە لێکۆڵینەوە لەسەر پەیوەندی نێوان ئەزموونی ڕۆحی وهیوا ومانای ژیان و خۆشحاڵی دەروونی. ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە مانای ژیان و هیوا دوو فاکتەر بوون لە نێوان ئەزموونی ڕۆحی و خۆشحاڵی دەروونیدا و لە نێوان ئەزموونی ڕۆحی و هەستی خۆشی، لەهەمانکاتدا هیچ پەیوەندیەکیان لە نێوان ئەزموونی ڕۆحی و هەستی ناخۆش نەدۆزیەوە.

## ئاییندارى و حاڵەتى دەروونى بە گشتى:

ژمارەیەکى زۆر لە توێژینەوە لەسەر پەیوەندى نێوان ئاییندارى و حاڵەتە جیاجیاکانى دەروونى لەسەر ئاستى جیهان ئەنجامدراوە. لە خوارەوە ئاماژە بە ١٥ لەم توێژینەوانە دەکەین کە لەم بوارەدا ئەنجام دراون.

قوربانى و هاوڕێکانى (Ghorbani, Watson, Ghramaleki, Morris & Hood, 2000) هەوڵیاندا پێوەرێك دابنێن بۆ پێوانى هەڵوێستى موسڵمانان بەرانبەر ئایین. هەروەها ویستیان بزانن ئەم پێوەرە پەیوەندى هەیە بە نیشانەکانى نەخۆشییە دەروونییەکان وپالنەرى ئایینى وئەزموونى سوفیەتى. سامپڵى ئەم توێژینەوەیە لە ١٧٨ خوێندکارى زانکۆ لە ئێران پێکهات. پێوەرى هەڵوێستى موسڵمان بەرانبەر ئایین نەیتوانى پێشبینى نیشانەکانى نەخۆشیە دەروونییەکان بکات، بەڵام پەیوەندییێکى ڕاستەوخۆى پێچەوانە دۆزرایەوە لە نێوان ئەم پێوەرە وئەم نیشانانە.

لەسەر پەیوەندى نێوان توندى بیروباوەڕى ئایینى و حاڵەتى دەروونى، پلانت و هاوڕێکانى ( Plante, Yancey, Sherman & Guertin, 2000) توێژینەوەیەکیان لەسەر ٣٤٢ خوێندکارى زانکۆ لە سێ زانکۆ کە پەیڕەوى ئایینزا جیاجیاکانى مەسیحیەتیان کردووە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانى ئەمەریکا ئەنجامدا.

ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوە دەریخست کە بەهێزیی بیروباوەڕی ئایینی لای یەکێك لەم سامپڵانە پەیوەندییەکی بەڵگەداری هەبوو لەگەڵ گەشبینی و مانای ژیان، لای سامپڵێکی دیکە پەیوەندی هەبوو بە هەڵکردن لەگەڵ فشاری دەروونی و گەشبینی و مانای ژیان و بینینی ژیان وەك ململانێیەکی پۆزەتیڤ و ئاستێکی نزمی دڵەڕاوکێ.

لای بەشێکی دیکە لە سامپڵی ئەم توێژینەوەیە بەهێزیی بیروباوەڕی ئایینی پەیوەندی هەبوو بە بینینی ژیان وەك ململانێیەکی پۆزەتیڤ و قبوڵکردنی خود، لە دەرەنجامدا توێژەران لەو بڕوایەدان کە ئەگەرچی پەیوەندییەکان مامناوەندی بوون لە رووی توندیدا، ئەنجامەکان پێشنیازی ئەوە دەکەن کە بەهێزیی بیروباوەڕی ئایینی پەیوەندی لەگەڵ چەند سوودێکی دەروونساغی پۆزەتیڤی گرنگ لای خوێندکارانی زانکۆ هەیە.

پاتریك دولین (Dulin, 2005) توێژینەوەیەکی ئەنجامدا لەسەر بەساڵاچووان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە مەبەستی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان پاڵپشتی کۆمەڵایەتی و بەشدارییکردن لە چالاکییە ئایینیەکان و ناڕەحەتی دەروونی لایان، ١١٥ بەساڵاچوو، کە تەمەنیان لەسەرووی ٦٥ ساڵ بوو بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد و وەڵامی ئەو ڕاپرسیانەیان داوە و زانیاری پێویستیان سەبارەت بە رەهەندەکانی توێژینەوەکە بە توێژەر دا.

ئەنجامی توێژینەوەکە ئاماژەی بەوەدا کە بەشدارییکردن بەردەوام پێشبینی هەڵچوونی ناخۆش دەکات ئەگەر کاریگەری گۆڕاوە

دیمۆگرافیەکانیش (وەك تەمەن و ڕەگەز و..هتد) کۆنترۆڵ بکرێن، هەستکردن بە بوونی پاڵپشتی کۆمەڵایەتی کاریگەری لەسەر پەیوەندی نێوان بەشداریکردنی ئایینی و ناڕەحەتی کۆمەڵایەتی هەیە، ئەنجامەکان بەدیاریانخست کە بەشداری ئایینی زۆر گرنگترە سەبارەت بە کەمکردنەوەی ناڕەحەتی لای ئەو بەساڵاچووانەی ئاستی پاڵپشتی کۆمەڵایەتییان لاوازە بە بەراورد بەوانە ئاستی پاڵپشتی کۆمەڵایەتییان بەرزە.

سالسمان و کارلسن (Salsman & Carlson, 2005) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی نێوان ئاڕاستەی ئایینی و باوەڕی پێگەیشتوو و ناڕەحەتی دەروونی کرد، بەشداربووان لەم توێژینەوەیە ٢٥١ کەس بوون کە تەمەنیان لە نێوان ١٧ تا ٢٥ ساڵ بوو و وەڵامی چەند ڕاپرسییەکیان داوە بە مەبەستی پێوانی ئاست و جۆری ئاییندای و ناڕەحەتی دەروونی.

بە شێوەیەکی گشتی ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە بەدیاریخست کە ڕەهەندەکانی ئاییندای پەیوەندی نێگەتیڤیان لەگەڵ پێوەرەکانی ناڕەحەتی دەروونیدا هەیە، بە شێوەیەکی تایبەتی، توێژینەوەکە دەریخست کە پەیوەندی نێگەتیڤ هەیە لە نێوان بڕوای پێگەیشتوو و ئایین وەك ئامانج لەگەڵ ڕق و بیرکردنەوەی پارانۆیا (بیرکردنەوەیەکە لەسەر بنەمای گومانکردن لە دەوروبەر دامەزراوە)، هەروەها باوەڕی پێگەیشتوو پەیوەندی نێگەتیڤی بە خەمۆکی و ناڕەحەتی دەروونی هەبوو، توێژەران دەگەنە ئەم دەرەنجامەی ئەو گەنجانەی کە خاوەن

باوەڕێکی پێگەیشتوون و ئەم باوەڕەیان بۆتە بەشێك لە ژیانی ڕۆژانەیان و پەیوەندییان لەگەڵ خودا مەسەلەیەکی سەرەکییە لایان، ئەم گەنجانە کەمتر دووچاری خەمۆکی و پارانۆیا (بەدگومانی) و ڕق و ناڕەحەتی دەروونی دەبنەوە.

ستێگەر و فرایزەر (Steger & Frazier, 2005) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی نێوان مانای ژیان و ئاییندارى و دروستی دەروونی کرد، لەم توێژینەوەیەدا ئەنجامی دوو لێکۆڵینەوە خرانەڕوو. بەشداربووان لەم توێژینەوەیە ٥١٢ خوێندکاری زانکۆ بوون. لە لێکۆڵینەوەی یەکەمدا، مانای ژیان کەوتە نێوان ئاییندارى و ڕەزامەندی لە ژیاندا و ڕێزگرتن لە خود و گەشبینیدا، ئەنجامی لێکۆڵینەوەی دووەم بەدیاریخست کە مانای ژیان دەکەوێتە نێوان ڕەفتاری ئایینی ڕۆژانە و هەستکردن بە خۆشحاڵی.

زوینگمان و هاوڕێکانی ( Zwingmann, Wirtz, Muller, Korber & Murken 2006) هەوڵیاندا ڕۆڵی هەڵکردنی ئایینی پۆزەتیڤ، وەك گەرانەوە بۆ ئایین بە شێوەیەکی متمانەئامێز و بیناکەرانە و هەڵکردنی ئایینیی نێگەتیڤ، وەك بوونی گومان و کێشە لەگەڵ ئاییندا، لای سامپڵێك لەو ئافرەتانەی تووشی شێرپەنجەی مەمك بوون لە ئەڵمانیا، بەشداربووان لەم توێژینەوەیە ژمارەیان ١٥٦ نەخۆش بوو.

ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە هەڵکردنی نائایینی، هەڵکردنی خەمۆك، دەکەوێتە نێوان هەڵکردنی ئایینی و ئەنجامە

دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانەوە، هەروەها یەکێکی دیکە لە ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوە ئەوە بوو کە پەیوەندی پۆزەتیڤ لە نێوان هەڵکردنی ئایینی پۆزەتیڤ و هەڵکردنی ئایینی نێگەتیڤ هەیە و بەیەکەوە هێزێکی پێشبینیکەر (ناڕاستەوخۆیان) هەیە لەسەر گونجانی دەروونی کۆمەڵایەتی، بەڵام بە ئاڕاستەی پێچەوانەوە، واتە هەڵکردنی ئایینی پۆزەتیڤ پەیوەندی نێگەتیڤی لەگەڵ هەڵکردنی خەمۆك هەبوو لە کاتێکدا هەڵکردنی ئایینی نێگەتیڤ پەیوەندی پۆزەتیڤی لەگەڵ هەڵکردنی خەمۆك هەبوو.

ماری گود و تینا و یلۆبای (Good & Willoughby 2006) هەوڵیاندا ڕۆڵی ڕۆحانیەت و ئاییندارى لە گونجاندنی دەروونی لای هەرزەکاران بزانن، لەم توێژینەوەیەدا بە جیا مامەڵە لەگەڵ ڕۆحانیەت و ئاییندارى کرا، واتە لە کاتی پێواندا لەیەکتر جودا کرانەوە، پێوەری ئاییندارى بریتی بوو لە ئامادەبوون بوو لە کەنیسە لە کاتێکدا پێوەری ڕۆحانیەت بریتی بوو لە باوەڕی کەسەکە بە خودا، یان بە هێزێکی باڵا، ژمارەی بەشداربووان ٦٥٧٨ هەرزەکار بوون کە تەمەنیان لە نێوان ١٣- ١٨ ساڵ بوو لە قوتابخانەکانی شاری ئۆنتاریۆ لە کەنەدا.

ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە گونجانی دەروونیی هەرزەکارە ئایینداره‌کان پۆزەتیڤتر بوو لە گونجانی دەروونیی هەرزەکارە نائاییندارەکان، بە بێ ڕەچاوکردنی ئاستی ڕۆحانیەت، بە بۆچوونی توێژەرکان، ئاییندارى گرنگترە لە ڕۆحانیەت لای هەرزەکاران، هەروەها لەو بڕوایشەدان کە سوودی ئاییندارى لەوانەیە بە تەواوی تایبەت نەبێت

به چوون بۆ کەنیسە، بەڵکو سوودەکە دەگەڕێتەوە بۆ بوون بە ئەندام لە گرووپێکدا، لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك ئاییندارى پەیوەندییەکى بێ وێنەى لەگەڵ گونجان هەیە، ئاستى رەفتارى مەترسیداریش کەم دەکاتەوە.

عەبدولخالق و ناسر (Abdel-Khaleq & Naceur, 2007) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندى نێوان ئاییندارى و سۆزە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکان لاى خوێندکارانى زانکۆ لە جەزائیر ئەنجامدا، سامپڵى ئەم توێژینەوەیە لە ٢٤٤ خوێندکارى موسڵمانى زانکۆ پێکهات.

ئەنجامى توێژینەوەکە دەریخست کە لاى پیاوان پەیوەندى لە نێوان ئاییندارى و دەروونساغى هەیە، لا ئافرەتان ئاییندارى پەیوەندیەکى پۆزەتیڤ و بەڵگەدارى لەگەڵ لەشساغى و دەروونساغى و رەزامەندى لە ژیان و گەشبینى و بەختەوەرى هەبوو، بەڵام پەیوەندى نێگەتیڤى لەگەڵ رەشبینى و دڵەڕاوکێدا هەبوو.

بجۆرك و تورمان (Bjorck & Thurman, 2007) لە توێژینەوەیەکدا هەوڵیاندا پەیوەندى نێوان ڕووداوە ناخۆشەکانى ژیان و شێوازەکانى هەڵکردنى ئایینى و گوزەرانى دەروونى بزانن، سامپڵى ئەم توێژینەوەیە لە ٣٣٦ کەس پێکهات کە وەڵامى ڕاپرسى توێژینەوەکەیان داوە.

ئەنجامى توێژینەوەکە دەریخست کە پەیوەندى لە نێوان ڕووداوى ناخۆش و زیاد بەکارهێنانى هەڵکردنى ئایینى پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ و کەمبوونەوەى گوزەرانى دەروونى هەیە، هەروەها ڕووداوە ناخۆشەکان

لەگەڵ هەڵکردنی ئایینی پۆزەتیڤ کاریگەرییان هەبوو لەسەر خەمۆکی، بە شێوەیەك کە زیاد بەکارهێنانی هەڵکردنی ئایینی پۆزەتیڤ دژی کاریگەری خراپی رووداوە ناخۆشەکان وەستا.

فرێنچ و هاوڕێکانی (French, Eisenberg, Vaughan, Purwono, & Suryanti, 2008) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی ئاینداری و ڕۆحانیەت بە توانای کۆمەڵایەتی و خۆگونجاندن لای هەرزەکاری موسڵمان لە ئیندۆنیسیا کرد، سامپڵی ئەم توێژینەوەیە لە ١٨٣ خوێندکار پێکهات کە لە قۆناغەکانی هەشتەم و نۆیەم بوون و ناوەندی تەمەنیان ١٣ساڵ بوو.

ئەنجامەکانی توێژینەوەکە دەریانخست کە بەشدارییکردن لە چالاکییە ئایینیەکان تاکە گۆڕاو بوو کە پەیوەندی بە پایە لە نێو هاوڕێیان و دەسکەوتی خوێندن، ڕێکخستنی هەڵچوونات، رەفتاری کۆمەڵایەتی و..هتد. توێژەران پەیوەندی نێوان بەشداری ئایینی و توانای هەرزەکارانیان بەو سیاقە لێکداوە کە ئایین لە جاڤای رۆژئاوا هەیەتی کە تیایدا خەلکەکەی بە گشتی بیروباوەڕی پتەویان بە ئیسلام هەیە و ئایین بووەتە بەشێك لە ژیانی رۆژانەیان.

توێژینەوەکەی مایلێڤسکی و لێە (Milevsky & Leh 2008) مەبەستی لێکۆڵینەوە بوو لە پەیوەندی نێوان هەندێ لە فاکتەرە خێزانیەکان و دوو جۆر لە دەربرینی ئاینداری: ئایین وەك ئامانج، ئایین وەك ئامراز.

هەروەها توێژینەوەکە هەوڵیدا پەیوەندی نێوان ئاییندارى و خۆگونجاندن لەلای گەنجان کەم دەرامەت، ٣٠٥ گەنج بەشدارییان لەم توێژینەوەیەدا کرد، لە ئەنجامدا بەدیارکەوت کە تەلاق و ئاستی رازیبوون لە ژیانی هاوسەرگیری و پاڵپشتی خێزان پەیوەندییان بە ئاینداریییەوە هەیە، ئەوانەی کە لە خێزانێك پەروەردە کرابوون کە تەڵاقی تیادا روونەدابێت، ئاستی ئاینداریییان، بە هەردوو جۆریەوە بەرزتر بوو، ئەوانەی کە ئاینداریییەکەیان لە جۆری ئایین وەك ئامانج، یان جۆری ئاینداریییەکەیان یەکلانەبۆتەوە لە نێوان دوو جۆرەکەی ئایینداری، ئاستی رێزلەخۆگرتنیان بەرزتر بوو بە بەراورد بەو کەسانەی کە جۆری ئاینداریەکەیان ئایین وەك ئامراز بوو.

سەبارەت بە کاریگەری ئایینداری لەسەر خۆنەگونجاندن (maladjustment) لای ئەو منداڵانەی کە خراپ مامەڵەیان لەگەڵ کراوە بە بەراورد بە منداڵانەی کە خراپ مامەڵەیان لەگەڵ نەکراوە، جەنگمین کیم (Kim 2008) توێژینەوەیەکی کرد. لەم توێژینەوەیەدا ١٨٨ منداڵی خراپ مامەڵە لەگەڵکراو و ١٩٦ منداڵی خراپ مامەڵە لەگەڵ نەکراو لە خێزانە کەمدەرامەتەکان بەشدارییان کرد.

تەمەنی منداڵەکان لە نێوان ٦ تا ١٢ ساڵ بوو، ئەنجامی توێژینەوەکە ئەوەی دەرخست کە ئایینداری رۆڵێکی پارێزەر دەبینێت لای ئەو منداڵانە، ئەوانەی بیروباوەڕی ئایینییان لا گرنگ بوو، ئاستی نیشانەکانی (ناوەوەی) خراپ خۆگونجاندنیان نزمتر بوو بە تایبەتی کچەکان، ئەو منداڵانەی کە بەشدارییان لە چالاکیيە ئایینییەکان دەکرد،

ئاستی نیشانەکانی (دەرەکی) خراپ خۆگونجاندیان کەمتر بوو بە تایبەتی لای کوڕان، توێژەر گەیشتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئایینداری ڕۆڵێکی پارێزەری هەیە بۆ ئەو منداڵانەی کە خراپ مامەڵەیان لەگەڵ کراوە لە نێو خێزانە کەمدەرامەتەکاندا.

ماسێلکۆ و بوکا (Maselko & Buka, 2008) توێژینەوەیەکیان دەربارەی چالاکی ئایینی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی دەروونییەکان بە درێژایی ژیان کرد، بە شێوەیەکی تایبەتیتر، ئەم توێژەرانە ویستویانە بزانن چ پەیوەندییەك لە نێوان گۆڕان لە چالاکی ئایینی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە دەروونییەکان بە درێژایی ژیان هەیە، ٧١٨ کەس بەشدارییان لەم توێژینەوەیەدا کرد کە تەمەنیان لە نێوان ٣٠ تا ٣٩ ساڵ بوو.

ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە بە گشتی پەیوەندی مانادار لە نێوان بەشدارییکردن لە چالاکییە ئایینیەکان و سێ نەخۆشی دەروونی (دڵەڕاوکێی گشتکراو، خەمۆکی گەورە، ئالوودەبوون بە ئەلکحول) نییە، بەڵام جیاوازی لە نێوان ژنان و پیاوان بەدی کرا، بۆ ئافرەتان، گۆران لە بەشدارییکردن لە چالاکییە ئایینیەکان (ئینجا چ وازهێنان لە بەشدارییکردن، یان بەشدارییکردن لە قۆناغی منداڵیەوە) پەیوەندی هەبوو بە زیادبوونی ڕێژەی تووشبوون بە دڵەڕاوکێی گشتکراو و ئالوودەبوون بە کحول بە درێژایی ژیان، بە بەراورد بەو ئافرەتانەی کە بەشدارییان لە چالاکییە ئایینییەکان بەردەوام وجێگیر بوو، بە پێچەوانەوە، ئەو پیاوانەی شێوازی بەشدارییکردنیان لە

چالاکییە ئایینییەکان لە رووی چەندییەوە گۆڕیوە، ئەگەری کەمتریان هەبوو لە هاتنەدی پێوەرەکانی دەستنیشانکردنی نەخۆشی خەمۆکی گەورە، بە بەراورد بەو پیاوانەی کە بەردەوام لە رووی ئایینیەوە چالاك بوون، رێژەی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە دەروونییەکان لە نێو ئەو کەسانەی کە هەرگیز بەشدارییان لە چالاکییە ئایینیەکان نەکردووە لە رووی ئامارییەوە جیاواز نەبوو لەگەڵ ئەو کەسانەی کە یان بە بەردەوامی لە رووی ئایینیەوە کارا بوون، یان ئەو کەسانەی کە شێوازی بەشدارییکردنیان لەم چالاکییانە گۆڕی بوو، توێژەران گەیشتنە ئەم دەرەنجامەی کە شێوازەکانی چالاکی ئایینی بە درێژایی ژیاندا پەیوەندی هەیە بە نەخۆشییە دەروونییەکان و جیاوازی لە نێوان پیاوان و ئافرەتانیش لەم رووەوە هەیە.

حوسەین و صدیق (Hossain & Siddique, 2008) توێژینەوەیەکیان کرد بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی (ئایا ئایینداری یارمەتی موسڵمانان دەدات لە خۆگونجاندن لەگەڵ مردندا؟).

سامپڵی ئەم توێژینەوەیە لە ١٥٠ کەسی بەنگلادیشی پێکهات کە تەمەنیان لە نێوان ٢٠ تا ٥٠ ساڵ بوو، ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە ئەوە بوو کە ئایینداری بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ کاریگەری لەسەر خۆگونجاندن لەگەڵ مردن هەیە.

سەید محمودی و هاوڕێکانی (Seidmahmoodi, Rahimi & Mohamadi, 2011) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی نێوان توانای

بەرەنگاربوونەوە (resiliency) و ئاڕاستەی ئایینی لەگەڵ گەشەی دوای زەبر لای کەسانی ئێرانی کرد.

ئاڕاستەی ئایینی بۆ دوو جۆر دابەشکرا: جۆری ئایین وەك ئامانج و جۆری ئایین وەك ئامراز، هەروەها توێژەران ویستیان بزانن ئایا هاوسەرگیری و ڕەگەز کاریگەرییەکی لەسەر ئەم پەیوەندییە هەیە، یان نا؟ ٣٥٠ خوێندکار لە زانکۆی شیراز بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد کە بە شێوەیەکی هەرەمەکی هەلبژێردرا بوون، ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە هەردوو بەشی توانای بەرەنگاربوونەوە: گەڕان بە دوای شتی نوێ و ئاڕاستەی پۆزەتیڤ بەرانبەر داهاتوودا، هەروەها جۆری ئایین وەك ئامانج پەیوەندییان بە گەشەی دوای زەبری دەروونیەوە هەبوو، ئەوانەی خێزاندار بوون، زیاتر گەشەیان کردبوو لە دوای زەبر بە بەراورد بەو کەسانەی کە زگورتی بوون، جۆری ئایین وەك ئامرازی کەسی و ڕێکخستنی سۆز، کە بەشێك بوو لە توانای بەرەنگاربوونەوە،پەیوەندییەکی مانادار و پۆزەتیڤیان هەبوو لەگەڵ گەشەی دوای زەبر، رەگەز و جۆری ئایین وەك ئامرازی کۆمەڵایەتی پەیوەندییان بە گەشەی دوای زەبر نەبوو.

## ئاییندارى و جۆرى کەسایەتی:

مرۆڤەکان خاوەن کەسایەتی جیاوازن، بەڵام ئایا کەسە ئاییندارەکان خاوەن کەسایەتیەکی جیاوازن لەو کەسانەی کە ئاییندار نین، یان ئاستی ئاییندارییان زۆر نزمە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە کۆمەڵێك

توێژینەوە ئەنجامدراوە، لە خوارەوە ئاماژە بە دوو توێژینەوە دەکەم کە پەیوەندیشی بەم بابەتەوە هەیە. هەردوو توێژینەوەکە پشتیان بە پۆلێنکردنی هانز ئێینزك بەستووە کە کەسایەتی بۆ سێ جۆر دابەش دەکات (Schultz & Schultz, 2005: 290-291):

**جۆری یەکەم:** ڕوو لە دەرەوە (Extraversion) لە بەرانبەر ڕوو لە ناوەوە (Introversion): ئەو کەسانەی کە لە جۆری ڕوو لە دەرەوەن کەسانی کۆمەڵایەتین و حەز دەکەن لەگەڵ کەسانی دیکە بن و کەسانی جۆری ڕوو لە ناوەوە، زیاتر حەز لە تەنیایی و ئارامی و گۆشەگیری دەکەن.

**جۆری دووەم:** ناجێگیری هەڵچوونی (Neuroticism) لە بەرانبەر جێگیری هەڵچوونییەوە: ئەو کەسانەی کە نمرەی بەرز لە ناجێگیری هەڵچوونیان دەست دەکەوێت کەسانێکن کە ئاستی خەم و نیگەرانی و گرژییان بەرزە و زوو زوو حاڵەتی دەروونییان دەگۆڕێت.

**جۆری سێیەم:** ئێینزیك ناوی لێناوە: (Psychoticism) کەسانی خاوەن ئەم جۆرە کەسایەتییە ئەم خەسڵەتانەیان هەیە: شەڕانگێزن، کار دژ بە کۆمەڵگا دەکەن، کەللە ڕەقن، خۆویستن و خوێنساردن.

بۆ بەدیارخستنی پەیوەندی کەسایەتی، بەپێی پۆلێنکردنی ئێیزنك، لەگەڵ ئاییندا، فرانسیس و جاکسن (Francis & Jackson, 2003) توژینەوەیەکیان بە بەشداربوونی ٤٠٠ خوێندکاری زانکۆ کرد. ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە بە شێوەیەکی گشتی هیچ پەیوەندیەك لە نێوان ئاییندارى و ڕەهەندی نیۆرۆتیسیزم لە کەسایەتیدا نییە.

سەبارەت بە پەیوەندی تایبەتی نێوان ئایینداری و ئەو رەهەندە بچووکانی دەکەونە ژێر رەهەندی نیۆرۆتیسیزم، ئەنجامەکان دەریانخست کە ئایینداری پەیوەندی پۆزەتیڤی بە هەستکردن بە تاوان هەیە، پەیوەندی نێگەتیڤی بە خەم هەیە، هیچ پەیوەندیەکی بە نزمی رێزگرتن لە خود، دڵەڕاوکێ، پشتبەستن بە کەسانی دیکە، وەهمی نەخۆشکەوتن و وەسواسەوە نییە.

لویس و فرانسیس و ئێنگەر (Lewis, Francis & Enger 2004) هەوڵیاندا بزانن تا چ رادەیەك ئەو بۆچوونەی کە توێژینەوەکان لەسەری کۆکن کە ڕەهەندی سایکۆتیزم، نەك ئێکستراڤێرشن (خاسیەتی کۆمەڵایەتی لای تاك) و نیۆرۆتیسیزم (واتە ناجێگیری لایەنی دەروونی) پەیوەندی بە دووبارەبوونەوەی زیاتر نزای کەسی و چوون بۆ کەنیسە هەیە؟ توێژینەوەکە لەسەر ٤٧٩ منداڵ کە تەمەنیان لە نێوان ١١ تا ١٨ ساڵ لە قوتابخانەکانی نەرویج ئەنجامدرا، بە شێوەیەکی گشتی پەیوەندییەکی مانادار لە نێوان زۆر دووبارەبوونەوەی نزای کەسی و چوون بۆ کەنیسە و نزمیی نمرەکان لەسەر ئاستی سایکۆتیزم دۆزرایەوە.

## سەرنج:

بە شێوەیەکی گشتی، ئەو توێژینەوانەی کە کورتەکانمان خستەڕوو ئاماژە بەوە دەکەن ئایینداری پەیوەندییەکی پێچەوانەی بە خەمۆکی و دڵەڕاوکێوە هەیە، بەڵام پەیوەندی بە خوشحاڵی دەروونی ڕاستەوانە و پۆزەتیڤە، چەند توێژینەوەیەکی کەم هەن کە هیچ پەیوەندییەکیان لە نێوان ئایینداری و خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و ناڕەحەتی دەروونیدا نەدۆزیوەتەوە، چەند توێژینەوەیەکی کەمی دیکەیش پەیوەندی پۆزەتیڤ، نەك نێگەتیڤ، لە نێوان ئایینداری و دڵەڕاوکێ و خەمۆکێ دۆزیوەتەوە.

هۆکاری ئەم جیاوازییە دەگەڕێتەوە بۆ چەند فاکتەرێك، هەندێکیان پەیوەندییان بە میتۆدی توێژینەوەکەوە هەیە، بە تایبەتی بابەتی هەڵبژاردنی پێوەر بۆ کۆکردنەوەی زانیاریەکان، هەندێکی دیکەیشیان پەیوەندییان بە تێگەیشتنی توێژەرەکانەوە بۆ چەمکەکان هەیە، فاکتەری دیکە هەن کە پەیوەندییان بە جیاوازی خودی ئایینەکانەوە هەیە، بەڵام بە گشتی، ئاڕاستەی ئەنجامی توێژینەوەکان لە بەرژەوەندی ئاییندارییە.

دەربارەی پەیوەندی نێوان ئایینداری و دەروونساغی، کتێبێکمان بە زمانی عەرەبی نووسیووە و خوێنەر دەتوانێت سەیری بکات و زانیاری زیاتر وەربگرێت (اسماعیل، ٢٠١٤).

## ئاییندارى و ئالوودەبوون:

ئالوودەبوون، بە گشتى، بە یەكێك لە گرفتە دەروونییەكان دادەنرێت، لە هەندێ حاڵەتیشدا، خودى ئالوودەبوون دەبێتە نەخۆشییەكى دەروونى كە پێویستى بە چارەسەركردن دەبێت، بە تایبەتى لە حاڵەتى ئالوودەبوون بە ماددەى ئەلكحول و ماددە هۆشگۆڕەكانى دیكە لە وڵاتانى رۆژئاوا، توێژینەوەیەكى زۆر لەسەر پەیوەندى نێوان ئالوودەبوون و ئاییندارى كراوە. لە خوارەوە ئاماژە بە پێنج لەم توێژینەوانە دەكەم.

ئامانجى توێژینەوەى فرانسیس و فێرن و لویس ( Francis, Fearn & Lewis 2005) دۆزینەوەى كاریگەرى كەسایەتى و دیندارى بوو لەسەر هەڵوێستى هەرزەكاران لە تەمەنى ١٦ تا ١٨ ساڵ بەرانبەر خواردنەوەى ئەلكحول لە ئێرلەنداى باكوور، ٢٤٣ كەس بەشدارییان لە وەڵامدانەوەى راپرسییەكانى ئەم توێژینەوەیە كرد.

ئەنجامى ئەم توێژینەوەیە بەدیارى خست ئەو كەسانەى هەڵوێستیان زیاتر بەرەو قەدەغەكردنى ئەلكحولە نمرەیان لەسەر رەهەندى سایكۆتیزم (زیادبوونى ئەگەرى تووشبوون بە نەخۆشى دەروونى) كەمترە و ئاڕاستەیەكى زیاتر پۆزەتیڤیان بەرانبەر مەسیحیەت هەیە، شیكردنەوەى ئامارى (multiregression) پاڵپشتى كرد لە گرنگیى رۆڵى هەڵوێست بەرانبەر ئایین لە پێشبینییكردنى جیاوازى نێوان كەسەكان لە هەڵوێستیان بەرانبەر خواردنەوەى ئەلكحول.

هەروەها دەربارى پەيوەندى نێوان ئاييندارى و بەكارهێنانى ماددەكان (تووتن، ئەلكحول، مەريهوانا) لاى ئەو كەسانەى لە سەرەتا و ناوەندى قۆناغى هەرزەكارين، ولكەر و هاوڕێكانى ( Walker, Ainette, Wills & Mendoza, 2007) توێژينەوەيەكيان كرد.

لەم توێژينەوەيەدا ١٢٧٣ خوێندكارى هەرزەكار لە قوتابخانە ئامادەييەكان بەشدارييان كرد، ئاييندارى بۆ دوو ڕەهەندى سەرەكى دابەشكرا: ڕەهەندى ڕەفتاريەكان كە ئينتيما و بەشداريكردنى گرتەوە، رەهەندى كەسى كە گرنگى، بەها، ڕۆحانيەت و لێخۆشبوونى گرتەخۆى. ئەنجامى شيكردنەوەى زانيارييەكان ئەوەبوو كە پەيوەندييەكى ناڕاستەوخۆى پێچەوانەيى هەيە لە نێوان رەهەندى ئاييندارى كەسى و بەكارهێنانى ماددەكان، ئاييندارى، لە لايەكى ديكەوە، پەيوەندى هەبوو بە كەمترين پەيوەندى هاوڕێيەتى خراپ و پەسەند نەكردنى ئەو فاكتەرانەى كە پالنەرن بۆ بەكارهێنانى ماددەكان.

چەند توێژەرێك (Rostosky, Danner and Riggle 2008) توێژينەوەيەكيان لەسەر پەيوەندى نێوان ئاييندارى و بەكارهێنانى ئەلكحول لاى گەنج و لاوان كرد. لە دوو كاتى جيادا، ١١٦٩٩ كەس، كە لە جارى يەكەم لە قۆناغى هەرزەكاريدا بوون و لە كاتى دووەمدا ببوونە لاو، بەشدارييان لە توێژينەوەكە كرد كە لە دوو گرووپى سێكسى جيادا بوون، لە قۆناغى هەرزەكارييەوە بۆ قۆناغى لاويەتى ئاستى ئاييندارى دابەزى، بەڵام بەرزى ئاستى ئاييندارى، بە هەردوو شێوەكەى: نزيك و دوور، پەيوەندى هەبوو بە كەمتر بەكارهێنانى ئەلكحول، يان

خورادنەوەی بڕێکی زۆری ئەلکحول لە یەککاتدا (Binge drinking) لای ئەو گرووپەی کە مەیلی سێکسیان بەرانبەر رەگەزی جودا هەبوو، نەك گرووپەکەی دیکە.

هۆرتۆن و هاوڕێکانی ( Horton, Ellison, Loukas, Downey & Barrett, 2012) توێژینەوەیەکیان کرد بۆ دۆزینەوەی پەیوندی نێوان جۆری وابەستەبوون بە خودا لەگەڵ ئەو جۆرە رەفتارانەی کە هەڕەشە لە تەندروستی دەکەن وەك خواردنەوەی ئەلکحول و بەکارهێنانی ماریهوانا و بەکارهێنانی مادده هۆشگۆڕەکان.

سامپڵی توێژینەوەکە لە ٣٢٨ خوێندکاری زانکۆ پێکهات، سەبارەت بە وابەستەیی (attachment) سێ جۆریان دەستنیشانکرد: وابەستەیی ئارام، وابەستەیی دوورکەوتنەوە، وابەستەیی ناجێگیر.

ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست وابەستەیی ئارام بە خودا پەیوەندی پێچەوانەی بە خواردنەوەی ئەلکحول و بەکارهێنانی ماریهوانا و مادده هۆشگۆڕەکانەوە نییە، بەڵام ئەوانەی جۆری وابەستەیی دوورکەوتنەوە، یان ناجێگیریان لەگەڵ خودا هەیە، زیاتر ئەلکحول دەخۆنەوە و ماریهوانا و مادده هۆشگۆڕەکان بەکاردێنن، لای پیاوان بە تایبەتی، توێژەران گەیشتنە ئەو ئەنجامەی بوونی وابەستەیی کێشەدار لەگەڵ خودا بەستراوە بە دەرهاوێشتەی ناپەسەند و خراپ.

کێندلەر و هاوڕێکانی ( Kendler, Liu, Gardner, McCullough, Larson and Prescott, 2003) لە توێژینەوەیەکدا هەوڵیاندا لێکۆڵینەوە لەسەر پەیوەندی نێوان رەهەندەکانی ئایینداری

لەگەڵ نەخۆشییە دەروونییەکان و بەکارهێنانی ماددە هۆشگۆڕەکان بکەن.

سەمپلەکە لە (٢٦١٦) لە جمکی نێر و مێ پێکهاتبوو، حەوت ڕەهەندیان لە ئاییینداری دەستنیشانکرد کە دووانیان (ئاییینداری کۆمەڵایەتی و سوپاسگوزاری) پەیوەندییان بە کەمبوونەوەی مەترسی تووشبوون بە نەخۆشییەکانەوە هەبوو (نەخۆشی دەرەکی وەك ئالوودەبوون و نەخۆشی ناوەکی وەك خەمۆکی و نەخۆشیەکانی دڵەڕاوکێ) و چوار لەو ڕەهەندانە (ئاییینداری گشتی، خودای کارا، لێبووردەیی، خودای بڕیاردەر) تەنها پەیوەندییان بە کەمکردنەوەی مەترسی تووشبوون بە نەخۆشییە دەرەکییەکان هەبوو، ڕەهەندی رقهەڵنەگرتن بە تەنها پەیوەندی بە کەمکردنەوەی مەترسی تووشبوون بە نەخۆشییە ناوەکییەکان هەبوو.

## سەرنج:

لە ڕوانگەی ئایینی ئیسلامەوە، بە حوکمی ئەوەی کە ماددە هۆشگۆڕەکانی لە جۆری ئەلکحول وماددەکانی دیکە قەدەغەکراون، واتە حەرامن، بۆیە شتێکی ئاساییە کە ئەو کەسەی ئاستی ئایینداری بەرز بێت، دوورتر دەبێت لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە ماددانە، بەڵام کێشەیەك هەیە لەسەر ئالوودەبوون بە جگەرە. دەشێ هەندێ کەسی ئاییندار ئالوودە بێت بە جگەرە، چونکە بە بۆچوونی خۆیان جگەرە قەدەغەکراو نییە، بە پێچەوانەوە، ئەگەر کەسێکی ئاییندار پێیوابێت کە جگەرەش ماددەیەکی هۆشگۆڕ و قەدەغەکراوە، ئەوا بە هەمان شێوە پەیوەندییەکی پێچەوانە لە نێوان جگەرەکێشان و ئایینداری دەدۆزینەوە.

## ئاییینداری و کێشەی خۆکوشتن:

خۆکوشتن (Suicide) یەکێکە لەو کێشە سەرەکییانەی کە ڕووبەڕووی زۆر لە کۆمەڵگاکان دەبێتەوە، بە کۆمەڵگای کوردی موسڵمانیش، لە خوارەوە کورتەی شەش لە توێژینەوەکان دەخەمە ڕوو کە لەسەر پەیوەندی نێوان ئاییینداری و خۆکوشتن کراوە.

محەممەد ئێسکین (Eskin 2004) توێژینەوەیەکی لەسەر کاریگەری پەروەردەی ئاییینی بەرانبەر بە پەروەردەی نائاییینی (سێکیولەر) لەسەر بیرکردنەوەی هەرزەکاران لە خۆکوشتن و هەڵوێستیان بەرانبەری لە تورکیا بە ئەنجام گەیاند.

دوو گرووپ لە هەرزەکاران بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد: گرووپێك کە پەروەردەی ئاییینیان وەرگرتووە، کە ژمارەیان ٢٠٦ بوو، گرووپەکەی دیکەیان پەروەردەی نائاییینی (یان سێکیولەریان) وەرگرتووە و ژمارەیان ٢١٤ هەرزەکار بوو.

ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە بیرکردنەوە لە خۆکوشتن زیاتر لای ئەو هەرزەکارانە باو بوو کە پەروەردەی نائاییینی کرابوون، ئەو گرووپە زیاتر قبوڵی خۆکوشتنیان دەکرد بە بەراورد بەو گرووپەی پەروەردەی ئاییینی کرا بوون، بەڵام گرووپی پەروەردەی ئاییینی زیاتر قبوڵی ئەو هاوڕێیانەی دەکرد کە بیریان لە خۆکوشتن کردۆتەوە بە بەراورد بە گرووپی پەروەردەی نائاییینی.

لە مالیزیاش، زورەیدە و ئەحمەد (Zuraida and Ahmad 2007) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی نێوان بیرکردنەوە لە خۆکوشتن و ئاییندارى کرد لای ئەو نەخۆشانەی کە خەمۆکن. ٥١ نەخۆش بەشدارییان لەم توێژینەوەیەدا کرد کە بە تووشبوو بە نەخۆشی خەمۆکی سەرەکی، یان دووجەمسەری دەستنیشانکرابوون کە تەمەنیان ٤١ساڵ بوو (ژن و پیاو و لە چوار ئایینی سەرەکی: ئیسلام، بودیزم، هیندۆس و مەسیحی)، ئەو نەخۆشانەی کە ئایینیان لا گرنگ بوو، کەمتر بیریان لە خۆکوشتن دەکردەوە بە بەراورد بەو نەخۆشانەی کە ئایینیان لا گرنگ نەبوو، ئەم ئەنجامە روونتربوو لای نەخۆشە موسڵمانەکان، توێژەرەکان گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی کە گرنگییدان بە ئایین ڕۆڵێکی پارێزەری دژی بیرکردنەوە لە خۆکوشتن هەیە.

لە شانشینی یەکگرتوو، زێین کەمال و کێیت لۆوێنتال ( Kamal & Lowenthal 2002) توێژینەوەیەکیان لەسەر بیروباوەڕ و رەفتاری خۆکوشتن لای موسڵمان و هیندۆس کرد،٤٠ لاوی هیندۆسی و ٦٠ لاوی موسڵمان بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد.

توێژینەوەکە چەند جیاوازییەکی نێوان ئەم دوو گرووپە دەستنیشانکرد، لاوە هیندۆسەکان کەمتر بڕوایان بە هۆکاری ئەخلاقی بوو بۆ ژیان بە بەراورد بە موسڵمانەکان، ئافرەتان بە گشتی کەمتر گرنگیان دەدا بە هۆکاری پەیوەست بە خێزان، یان ترس لە خۆکوشتن بە بەراورد بە پیاوان.

سەبارەت بە بیرکردنەوە لە خۆکوشتن، پلاندان و رەفتاری خۆکوژی، جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان گرووپەکاندا نەبوو کە شایەنی باس بێت، بە بۆچوونی توێژەران، جیاوازی ناوەڕۆکی کتێبە ئاسمانییەکان لە ئیسلام و هیندۆسی سەبارەت بە خۆکوشتن، هۆی ئەو جیاوازییە بوو کە لە نێوان گرووپەکان تێبینی کران.

کۆمەڵێك توێژەر لە کەنەدا ( Rasic, Kisely and Langille 2011) لێکۆڵینەوەیەکیان بۆ بەدیارخستنی پەیوەندی نێوان ئایین و ئەگەری تووشبوون بە خەمۆکی و ڕەفتاری خۆکوژی و بەکارهێنانی مادده هۆشگۆڕەکان (هۆشبەرەکان) لای هەرزەکاران، کرد.

١٦١٥ خوێندکاری هەرزەکار کە تەمەنیان لە نێوان ١٥ تا ١٩ ساڵ بوو بەشدارییان لە توێژینەوەکە کرد. توێژینەوەکە لە ساڵی ٢٠٠٦ ئەنجامدرا و بەدیاریخست کە زۆر گرنگییدان بە ئایین لای کچان پەیوەندی هەبوو بە نزمبوونەوەی ئەگەری تووشبوون بە خەمۆکی، بیرکردنەوە لە خۆکوشتن، خواردنەوە و بە بەکارهێنانی ماریوانا (ماددەیەکی هۆشبەرە)، هەروەها بەشداریکردنی زۆر لە چالاکییە ئایینییەکان فاکتەرێکی پارێزەر بوو لە بەرانبەر رەفتاری بەکارهێنانی مادده هۆشگۆڕەکان و بیرکردنەوە لە خۆکوشتن. گرنگی ئایین کاریگەرییەکی پارێزەری لاوازی هەبوو بەرانبەر بە خەمۆکی و بیرکردنەوە لە خۆکوشتن لای کچان بە پێچەوانەی بەشدارییکردن، بەڵام ئەم پەیوەندییە لای کوڕان تێبینی نەکرا. بەشدارییکردن لە چالاکییە ئایینییەکان پەیوەندییەکی بەردەوامی هەبوو بە کەمتر بەکارهێنانی

مادده هۆشگۆڕەکان لای کچان، بەڵام گرنگیدان بە ئایین ئەم پەیوەندییەی نەبوو، لای کوڕان، گرنگییدان بە ئایین ڕۆڵێکی پارێزەری هەبوو لە بەرانبەر بەکارهێنانی ماریوانا لای کوڕان و بەشداربوونیان لە چالاکییە ئایینییەکان ڕۆڵێکی پارێزەری هەبوو لە بەرانبەر زۆرخواردنەوە، دەرەنجامی ئەم توێژینەوە ڕۆڵی پارێزەری ئاییندارى لای هەرزەکارانی کەنەدی دەسەلمێنێت.

راسیك لەگەڵ کۆمەڵێك توێژەری دیکە ( Rasic, Robinson, Bolton, Bienvenu and Sareen, 2011) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی درێژماوەی نێوان ئامادەبوونی لە پەرستشە ئایینییەکان و ڕۆحانیەت لەگەڵ خەمۆکی گەورە، تێکچوونەکانی دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوە و هەوڵدان بۆ خۆکوشتن کرد. توێژینەوەکە لەسەر ١٠٩١ کەس کرا، لە ئەنجامدا بەدیارکەوت ئەو کەسانەی کە بەلای کەمەوە لە ساڵێك جارێك بەشدارییان لە چالاکییە ئایینەکان کردووە ئەگەری هەوڵی خۆکوشتنیان کەم بۆتەوە بە بەراورد بەو کەسانەی کە هەرگیز بەشدارییان لەم جۆرە چالاکییانە نەکردووە، هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ئاسوودەیی ڕۆحییش ئەگەری بیرکردنەوەی لە خۆکوشتن کەمکردۆتەوە.

لە دەرەنجامدا توێژەران روونی دەکەنەوە کە وادیارە ئامادەبوون لە چالاکییە ئایینیەکان فاکتەرێکی پارێزەر بێت لە دژی هەوڵی خۆکوشتندا.

ژمارەیەکی زۆر لە توێژەران (Kaslow et al 2004) بەشدارییان لە توێژینەوەیەك کرد دەربارەی ئەو فاکتەرە کەسییانەی پەیوەندییان بە رەفتاری خۆکوشتن لای پیاو و ژنە ئەفریقییە ئەمەریکییەکان هەیە کە ئاستی داراییان نزمە.

سامپڵی توێژینەوەکە لە ٢٠٠ کەس پێکهات و لەسەر چوار گرووپ دابەشبوون (٥٠ پیاو کە هەوڵی خۆکوشتنیان نەداوە، ٥٠ پیاو کە هەوڵی خۆکوشتنیان داوە، ٥٠ ئافرەت کە هەوڵی خۆکوشتنیان نەداوە، ٥٠ ئافرەت کە هەوڵی خۆکوشتنیان داوە). توێژینەوەکە جیاوازی بەرچاوی بەدی کرد لە نێوان گرووپە هەوڵدەرەکان و هەوڵنەدەرەکان، ئەوەی پەیوەندی بە بابەتی ئەم کتێبەوە هەبێت، ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست ئەو کەسانەی هەوڵی خۆکوشتن دەدەن ئاستی ئاییندارییان نزمترە بە بەراورد بەو کەسانەی کە هەوڵی خۆکوشتن نادەن.

## سەرنج:

شتێکی زانراوە کە زۆربەی زۆری ئایینەکان دژی خۆکوشتنن و بە پیرۆزی تەماشای ژیانی مرۆڤ دەکەن، بۆیە شتێکی ئاساییە کە تێبینی ئەوە بکەین مرۆڤە ئاییندارەکان پەنا نابەنە بەر خۆکوشتن، ئەگەرچی بیریشی لێ بکەنەوە، چونکە بە بۆچوونیان ئەم کارە دژی ویستی خودایە.

## ئاییندارى و كێشەكانى خێزان

خێزان ڕۆڵێكى گرنگى لە ژیانى تاكەكانى بە گشتى و لە ژیانى ئایینییان بە شێوەیەكى تایبەتى هەیە، بۆیە بوونى كێشە لە نێو خێزاندا، لە زۆربەى حاڵەتەكاندا، كاریگەرى نێگەتیڤ و خراپى لەسەر لایەنى دەروونى ئەندامەكانى دەبێت، كۆمەڵێك توێژینەوە لەسەر پەیوەندى نێوان كێشەكانى خێزان و ئاییندارى كراوە و لە خوارەوە ئاماژە بە كورتەى حەوت لەم توێژینەوانە دەكەم.

سەبارەت بەوەى كە ئایا پێگەیاندنى كۆمەڵایەتى ئایینى، یان نائایینى كاریگەرى لەسەر خۆگونجاندن هەیە، هەنسپێرگەر و پرات و پانسەر (Hunsberger, Pratt & Pancer, 2001) دوو توێژینەوەیان ئەنجامدا.

لە توێژینەوەى یەكەمدا ٢١٦ خوێندكار لە زانكۆى كەنەدى بەشدارییان كرد كە پاشخانى ئایینى جیاجیایان هەبوو، واتە بە شێوازى ئایینى و نائایینى جیاواز پەروەردە كرابوون، ئەنجامى ئەم توێژینەوەیە دەریخست كە پاشخانى جیاجیاى ئایینى هیچ پەیوەندییەكى بە پێوەرەكانى خۆگونجاندن نەبوو.

لە توێژینەوەى دووەمدا ٦١٥ خوێندكارى ئامادەیی بەشدارییان كرد و بە هەمان شێوە كرانە چەند گرووپێك بە پێى پاشخانى ئایینى خێزانەكانیان، لەم توێژینەوەیەشدا پاشخانى ئایینى خێزان لە پەروەردەكردندا هیچ پەیوەندیەكى بە پێوەرەكانى خۆگونجاندن نەبوو

که بریتی بوون له خەمۆکی، ڕێزگرتن له خود، گەشبینی و پاڵپشتی کۆمەڵایەتی.

ئەم توێژەرانه دەگەنه ئەوە دەرەنجامەی که ئەنجامی ئەم دوو توێژینەوەیه پاڵپشتیەکی زۆر کەمی ئەو بۆچوونه دەکات که پێیوایه پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی ئایینی کاریگەری پۆزەتیڤی لەسەر خۆگونجاندنی گەنجاندا هەیه، بەڵام ئاستی ئاییندارى ئێستای گەنجەکان پەیوەندییەکی لاوازی به پێوەرەکانی خۆگونجاندن هەبوو.

وێب و ویتمەر (Webb & Whitmer, 2003) توێژینەوەیەکیان، دەربارەی پەیوەندی نێوان ئاستی ئاییندارى دایك و باوك و مێژووی خراپ مامەڵه لەگەڵکردن و مانەوەی بیروباوەڕ له خێزان، کرد.

سامپڵی ئەم توێژینەوەیه له ١٦٧ خوێندکاری زانکۆ پێکهات و وەڵامی دوو ڕاپرسییان دایەوە دەربارەی ئاییندارى دایك و باوك و مێژووی بوونی خراپ مامەڵه لەگەڵکردن له ڕووی سۆزی و جەستەیی. ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیه دەریخست که پەیوەندییەکی نێگەتیڤ له نێوان بوونی خراپ مامەڵه لەگەڵکردن و مانەوەی بیروباوەڕ هەیە، هەروەها ئاییندارى دایك و باوك پەیوەندی پۆزەتیڤی هەبوو لەگەڵ مانەوەی بیروباوەڕ لای منداڵان و پەیوەندی نێگەتیڤی هەبوو لەگەڵ خراپ مامەڵه لەگەڵکردندا، واته ئەو دایك و باوکەی ئاستی ئاییندارییان بەرزە، کەمتره به خراپ مامەڵه لەگەڵ منداڵەکانیان دەکەن به بەراورد بەو دایك و باوکانەی که ئاستی ئاییندارییان نزمە.

براون و هاوڕێکانی (Brown, Nesse, House & Utz, 2004) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی نێوان ئایین و قەرەبووکردنەوەی سۆزداری لای ئەوانەی هاوسەرەکانیان لەدەستداوە کرد.

توێژەران هەوڵی ئەوەیاندا ئەو گریمانە تاقی بکەنەوە کە دەڵێت: لەدەستدانی هاوسەر دەبێتە هۆی ئەوەی کە گرنگی بیروباوەڕی ئایینی و ڕۆحی لای کەسی لەدەستدەر زیاتر بێت، بۆ ئەم مەبەستە ١٠٣ بێوەژن و بێوەمێرد بەشدارییان لەم توێژینەوەیەدا کرد و سێ جار زانیاری پێویستیان بە توێژەران دا، جاری یەکەم لە دوای شەش مانگ و جاری دووەم لە دوای ٢٤ مانگ و جاری سێیەم لە دوای ٤٨ مانگ پاش لە دەستدانی هاوسەرەکەیان، ئەم گرووپە بەراورد کرا بە گرووپێکی دیکە کە هاوسەرەکانیان لەدەستنەدابوو (واتە گرووپی کۆنترۆڵکراو).

ئەنجامەکانی ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە بیروباوەڕی ئایینی و ڕۆحی ئەو کەسانەی هاوسەرەکانیان لەدەستداوە بە بەراورد بە گرووپی کۆنترۆڵکراو (واتە ئەو کەسانەی کە هاوسەرەکانیان لەدەستنەداوە) زیادیکردووە، هەروەها زیادبوونی ئەم بیروباوەڕە پەیوەندی هەبوو بە کەم بوونەوەی خەمی لەدەستدان، بەڵام کاریگەری لەسەر کەمکردنەوەی خەمۆکی نەبوو، وێڕای ئەمەش، ئەنجامەکان نیشانیاندا ئەو کەسانەی هەستیان بە نائارامی کردووە زیاتر سوودیان لە زیادبوونی بیروباوەڕی ئایینی و ڕۆحی وەرگرتووە.

فینچام و هاوكارانی ( Fincham, Beach, Lambert, Stillman & Braithwaite, 2008 ) سێ توێژینەوەیان سەبارەت بە ڕەفتاری ڕۆحانی و ئاستی ڕازیبوون لە پەیوەندی هاوسەرگیری ئەنجامدا، بە تایبەتیش لێكۆڵینەوەكەیان لەسەر ڕۆڵی دوعا، یان نزاكردن بۆ هاوسەر بوو.

لە توێژینەوەی یەكەمدا ٣٠٢ كەس بەشدارییان كرد، ئامانجی لێكۆڵینەوەی پەیوەندی درێژخایەن بوو، ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە دەریخست كە دوعاكردن بۆ هاوسەر پێشبینی ئاستی ڕازیبوون لە پەیوەندی نێوانیانی كرد، بەڵام پێچەوانەكەی ڕاست نەبوو.

لە توێژینەوەی دووەمدا ١٩١ كەس بەشداری كرد، ئامانجی ئەوە بوو بزانێت ئایا دوعاكردن بە گشتی، یان دوعاكردن بە تایبەتی بۆ هاوسەر كاریگەری لەسەر پەیوەندی هاوسەرگیری هەبووە؟ ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە ئاشكرای كرد كە دوعاكردن بۆ هاوسەر كایگەریەكی تایبەتی هەیە، ئەم كاریگەرییەش گەورەترە لە ڕەفتار پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەكانی ژن و مێرد.

لە توێژینەوەی سێیەمدا ٣٦٠ بەشداری كرد و ئامانج لێی دۆزینەوەی ئەو فاكتەرانە بوو كە لە نێوان كاریگەری دوعاكردن بۆ هاوسەر و جۆری پەیوەندی نێوانیان، ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە بەدیاریخست كە زیادبوونی پابەندی فاكتەرێك بوو لە نێوان دوعاكردن و ڕازیبوون لە پەیوەندی هاوسەرگیری، لێكدانەوەی ئەم ئەنجامانەش بەم شێوەیە

بوو: دوعاکردن بۆ هاوسەر کاریگەری لەسەر پابەندبوونی درێژخایەن و ڕازیبوونی هاوسەرەکان لە پەیوەندییەکانیان، هەیە.

لیچتەر و کارمالت (Lichter and Carmalt 2009) توێژینەوەیەکیان بۆ بەدیارخستنی ڕۆڵی ئایین (ئینتما و بیروباوەڕ و پیادەکردن) لە بەهێزکردن و جێگیرکردنی ژیانی هاوسەرگیری لای ئەو خێزانانەی کەمدەرامەتن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەنجامدا.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر ٤٣٣ ژن و مێرد ئەنجامدرا، ئەنجامی توێژینەوەکەش ئاماژەی بەوە کرد کە ژن و مێردە کەمدەرامەتەکان نمرەیان بەرز بوو لەسەر رەهەندە جیاجیاکانی جۆری هاوسەرگیری (بۆ نموونە پابەندبوون و پاڵپشتیکردن لە ریی سۆز و.. هتد)، هەروەها ئەنجامی توێژینەوەکە ئەوەی دەرخست کە ئینتیما بۆ ئایین (سەر بە ئایینێك بوون) و بیروباوەڕی ئایینی کەسیی گرنگییان کەمترە لە جۆری هاوسەرگیری بە بەراورد بەوەی ژن و مێردەکە هەمان بیروباوەڕیان هەبێت سەبارەت بە پلانی خودا بۆیان و بۆ پەیوەندییەکەیان، یان کە بەیەکەوە نزا (نوێژ) دەکەن، یان بەیەکەوە لە چالاکییە ئایینییەکان ئامادە دەبن، لە دەرەنجامدا توێژەرەکان ئاماژە بە ڕۆڵی گرنگی رێکخراوە ئایینییەکان دەکەن لە پتەوکردن و پەرەپێدانی ژیانی ڕۆحی و جۆری پەیوەندی هاوسەرگیری بۆ ئەندامەکانیان.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئاستی ئایینی خێزان و ئەگەری بوونی نەخۆشی دەروونی لای ئەو منداڵانەی کە دایکیان تووشی خەمۆکی بووە، جاکوبس و هاوڕێکانی ( Jacobs, Miller, Wickramaratne, Gameroff & Weissman 2012) توێژینەوەیەکی درێژماوەیان ئەنجامدا بۆ سەلماندنی توێژینەوەیەکی پێشوویان لەسەر ئەم بابەتە.

ژمارەی ئەو دایکانەی بەشدارییان لەم توێژینەوەیەدا کرد ٤٥ بوو و ژمارەی منداڵەکانیشیان کە بوونە بەشی دووەمی سامپڵی توێژینەوەکە ٧٨ منداڵ بوو، توێژەران هەوڵیاندا چاوپێکەوتنی نیمچە ڕێکخراو بەکاربێنن بۆ دۆزینەوە ئاستی نەخۆشی خەمۆکی گەورە لە دوو کاتدا کە ماوەی نێوانیان ١٠ساڵ بوو، ئاستی ئاییندارییش لە سێ ڕێگاوە پێورا: هەڵسەنگاندنی لایەنی ڕۆحانیەت لای کەسەکە، ئامادەبوون لە چالاکییە ئایینییەکان و پابەندبوون بە مەزهەبی ئایینی.

ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە تووشبوونی دایك بە خەمۆکی ڕێگرە لە گواستنەوەی گرنگیی ئایین بۆ نەوەکانی، بەڵام کاریگەری لەسەر ئامادەبوونی نەوەکانیان لە چالاکییە ئایینییەکان، یان پابەندبوونیان بە مەزهەبێکی دیارییکراوەوە نییە، هەروەها ئەنجامەکە ئەوەی دەرخست کە هاومەزهەبی نێوان دایك و نەوەکانی ڕۆڵێکی پارێزەر دەبینێت و ئەگەری تووش بوونی نەوەکانیان بە دڵەڕاوکێ و خەمۆکی لە قۆناغی منداڵیدا بە ڕێژەی ٩١٪ کەم دەکاتەوە، ئەگەرچی دایکەکەش تووشی خەمۆکی بووبێت.

لەگەڵ ئەوەی ئەم توێژینەوە چەند کەموکورتیەکی تێدایە وەك: (بچووکی سامپڵەکەی و سنوورداری پێوانی ئاییناداری)، توێژەران گەیشتنە ئەو دەرنجامەی کە رێککەوتنی خێزان لەسەر مەزهەبێکی ئایینی و پیادەکردنی سرووتەکانی سەرچاوەیەکی بەهێزە بۆ پاراستنی گەنجان لە تووشبوون بە نەخۆشی خەمۆکی گەورە، دوور لە کاریگەری خەمۆکی دایکەکانیان.

هیگنبۆتام و هاورێکانی (Higginbotham et al 2007) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی نێوان ئاییناداری و شێوازی وابەستەیی و توندتیژی لەلایەن کەسی خۆشەویستەوە، کرد.

سامپڵی توێژینەوەکە لە ٢٩٩ کچە خوێندکاری زانکۆ پێکهات کە تەمەنیان لە نێوان ١٨ تا ٢٤ساڵ بوو، لە ئەنجامی توێژینەوەکەوە بەدیارکەوت کە پەیوەندییەکی بەڵگەدار لە نێوان شێوازی وابەستەیی و ئایینادار هەیە لەگەڵ بوون بە قوربانی توندوتیژی بە دەست کەسی خۆشەویستەوە، بە گشتی ئەو کچانەی کە ئاستی ئایینادارییان نزم بوو و شێوازی وابەستەییان نائارام بوو، زیاتر ڕووبەڕووی توندوتیژی لەلایەن کەسی خۆشەویست بوونەوە بە بەراورد بەو کچانەی کە ئاستی ئایینادارییان بەرز و شێوازی وابەستەییان ئارام بوو، هەروەها ئەنجامەکان ئاماژەیان بەوەدا کە کاتێك پەیوەندی ئاییناداری لە نێوان ژن و مێرد بەهێز بێت، ئافرەتەکە کەمتر ڕووبەڕووی توندوتیژی دەبێتەوە.

## ئاییނداری و هەستکردن بە بەختەوەری:

بەختەوەری (Happiness) بابەتێکی گرنگە لەو بابەتانەی کە سایکۆلۆجیای پۆزەتیڤ جەختی لەسەر دەکات و توێژینەوەی لەسەر ئەنجام دەدات، بەختەوەری مرۆڤ بە کۆمەڵێك فاکتەرەوە بەستراوە، یەکێکیش لەو فاکتەرانە ئاییندارییە.

لە خوارەوە ئاماژە بە کورتەی ١١ توێژینەوە دەکەم کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر پەیوەندی نێوان ئاییداری و هەستکردن بە بەختەوەری لە نێوان گرووپە جیاوازەکاندا، کردووە.

سەبارەت بە ڕۆڵی بەشدارییکردن لە چالاکییە ئایینیەکان و ڕۆحانیەت و ئەو مانایەی کەسێك بە ژیان دەیدات لە خۆشحاڵی دەروونی کەسانی بەساڵاچوو، فرێی (Fry, 2000) توێژینەوەیەکی لەسەر ٣٤٠ کەسی بەساڵاچوو کرد لە کەنەدا کە تەمەنیان لە ٦٠ ساڵ زیاتر بوو.

ئەم کەسە بەساڵاچووانە هەندێکیان لە خانووی ئاساییدا دەژیان و هەندێکی دیکەیان لە خانەی بەساڵاچووان، ئەنجامەکان نیشانیاندا کە بوونی مانای کەسی بۆ ژیان و بەشدارییکردن لە ئایینە فەرمییەکان و چالاکییە ڕۆحیەکان و گرنگی ئایین و ئاستی ئەو ئاسوودەییەی کە لە ئایین وەردەگیرێت و هەبوونی هەستکردن بە ئارامی و گەیشتن بە سەرچاوە ئایینیەکان بە ئاسانی، ئەمانە هەموو پێشبینی گرنگ بوون بۆ هەستکردن بە خۆشحاڵی لای بەشداربووان، زیاتر لەوەش، ئەنجامەکان سەلماندیان کە بوونی مانا بۆ ژیان و ئاییداری و ڕۆحانیەت ڕۆڵێکی

گرنگتر، لە هەندێ گۆڕاوی دیمۆگرافی وەك: سەرچاوەی كۆمەڵایەتی و تەندروستی و رووداوە ناخۆشەكانی ژیان، دەبینێت لە هەستكردنی بەساڵاچووان بە خۆشحاڵی.

ئای و پیترسن و هوانگ (Ai, Peterson & Huang, 2003) توێژینەوەیەكیان لەسەر سامپڵێك لە موسڵمانانی كۆسۆڤۆ و بۆسنیە كە پەناهەندە بوون لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا، كرد.

توێژەران هەوڵیاندا كاریگەری هەڵكردنی ئایینی/ ڕۆحی لەسەر دروستبوونی هەڵوێستی پۆزەتیڤ لای ئەم گرووپە بزانن، بۆ ئەم مەبەستە، توێژەران زانیارییان سەبارەت بە ئاستی ئاییناری، زەبری جەنگ، هەڵكردنی ئایینی/ ڕۆحی، گەشبینی و هیوا لای ١٣٨ پەنابەر كۆكردەوە، ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە بەدیاری خست كە گەشبینی پەیوەندی پۆزەتیڤی بە شێوازی هەڵكردنی ئایینی/ ڕۆحی پۆزەتیڤ هەبوو، كە ئەمەشیان پەیوەندی بە زیادبوونی ئاستی ئایینداریەوە هەبوو، بەڵام هیوا پەیوەندییەكی نێگەتیڤی بە شێوازی هەڵكردنی ئایینی/ ڕۆحی نێگەتیڤ هەبوو.

لویس و ماڵتبی و دەی (Lewis, Maltby & Day 2005) توێژینەوەیەكیان لەسەر پەیوەندی نێوان ئایین و بەختەوەری لە میرنیشینە یەكگرتووەكان كرد، لەم توێژینەوەیەدا، توێژەران بە جیا مامەڵەیان لەگەڵ خودخۆشحاڵی (Subjective Well-being) و خۆشحاڵی دەروونی (Psychological Well-being) كرد.

بەشداربوونی ئەم توێژینەوەیە ١٣٨ کەسی گەورە بوون، لە ئەنجامدا بە شێوەیەکی گشتی هیچ جیاوازییەکی مانادار بەدی نەکرا لە نێوان نمرەکانی بەشداربووان لە پێوەری ئاینداری وپێوەری بەختەوەرییدا، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی پەیوەندییەکی مانادار هەبوو لە نێوان بەرزی نمرەکان لەسەر پێوەری ئایین، وەك: ئامانج و پێوەری هەڵکردنی ئایینی پۆزەتیڤ لەلایەك و بەرزی نمرەکان لەسەر پێوەری ئۆکسفۆرد بۆ بەختەوەری، توێژەران گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کاتێك ئاینداری پەیوەندی بە بەختەوەرییەوە هەیە، ئەوا لە راستییدا پەیوەندییەکە لەگەڵ خۆشحاڵی دەروونییە کە ئەمەش رەنگدانەوەی گەشەی مرۆیی و گوزەرانی پۆزەتیڤ و پرسە وجودییەکانە لە ژیاندا.

کریستاڵ پارك (Park, 2006) توێژینەوەیەکی بە مەبەستی دۆزینەوەی پەیوەندی لە نێوان ئاینداری و مانای ڕووداوە ناخۆشەکان و خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو کێشە دژوارانەی کە بەساڵاچووان ڕووبەڕووی دەبنەوە ئەنجامدا، ٨٣ کەسی بەساڵاچوو و کە ناوەندی تەمەنیان زیاتر لە ٧٧ ساڵ بوو بەشدارییان لەم توێژینەوەیە کرد و زانیارییاندا لەسەر ئەو کێشانەی ڕووبەڕوویان بۆتەوە، هەڵسەنگاندنیان بۆ ئەم ڕووداوانە و ئاستی ئاینداری و ئەو شێوازە ئایینیانەی بەکاریانهێناوە بۆ هەڵکردن لەگەڵ کێشەکاندا، لە دوای مانگێکدا، ٦٩ لە بەشداربووان زانیارییان سەبارەت بە خۆگونجاندن (نیشانەکانی خەمۆکی، تەندورستیان، گەشەکردن لە ئەنجامی فشاردا)، لە ئەنجامدا بەدیارکەوت کە ئاینداری پەیوەندی بەو مانایانە هەیە کە تاك دەیخاتە پاڵ سەرچاوەکانی فشار و

پەیوەندی لەگەڵ خۆگونجاندندا هەیە، بەڵام پاڵپشتییەکی لاواز هەبوو بۆ ئەو بۆچوونەی کە پێیوایە ئەو مانایانەی کە دەدرێنە پاڵ ڕووداوەکان دەکەونە نێوان ئایینداری و خۆگونجاندن.

لە توێژینەوەیەك لەسەر خوێندکارانی زانکۆ لە کوەیت، ئەحمەد عەبدولخالق (Abdel-Khalek, 2006) هەوڵیدا لە پەیوەندی نێوان بەختەوەری و تەندروستی و ئایینداری بکۆڵێتەوە، هەروەها گرنگیدا بە جیاوازی نێوان کوڕان و کچان سەبارەت بەم سێ گۆڕاوە، سامپڵەکەی لە ٢٢١٠ خوێندکاری زانکۆ پێکهات (١٠٥٦ کور و١١٥٤ کچ)، ئەنجامی توێژینەوەکە ئەوەی دەرخست موسڵمانی کوەیتی ئاییندار بەختەوەرترە.

گرین و ئیلیۆت (Green & Elliott 2010) توێژینەوەیەکیان کرد سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئایینداری و تەندروستی و خۆشحاڵی بە دوورخستنەوەی کاریگەری پیشە وخێزان لەسەر ئەم پەیوەندییە. بۆ ئەم مەبەستە زانیارییەکانیان لە توێژینەوەیەکی پێشوو وەرگرت کە لە ساڵی ٢٠٠٦ ئەنجامیان دابوو و قەبارەی سامپڵەکە زیاتر لە هەزار کەس بوو کە تەمەنیان لەسەرووی ١٨ ساڵ بوو، ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە ئەو کەسانەی خۆیان بە ئاییندار لەقەڵەم داوە، ئاستی تەندروستی و خۆشحاڵیان بەرزە بە بێ ڕەچاوکردنی جۆری ئایینەکە، چالاکی ئایینی، پیشە، خێزان، پاڵپشتی کۆمەڵایەتی و باری دارایی کەسەکە، ئەو کەسانەی کە خاوەن بیروباوەڕی ئایینی ئازاد بوون، هەرچەندە وا بەدیارکەوت کە تەندورستیان باشترە، بەڵام ئاستی

خۆشحاڵییان نزمتر بوو بە بەراورد بەو کەسانەی کە بیروباوەڕی ئایینی توونديان هەبوو.

جێف لێڤین (Levin 2013) توێژینەوەیەکی لەسەر پەیوەندی نێوان ئایین و بەختەوەری لەنێو جوولەکەکانی ئیسرائیل کرد، سامپڵەکە ٩٩١ کەسی گرتەخۆی و داتاکانی ساڵانی ٢٠٠٩ و٢٠١٠ ی بەکارهێنا. گشت پێوەرەکانی ئاییندارى کە لە توێژینەوەکە بەکارهات (چوون پۆ پەرستگا، دوعا و نوێژکردن، بێگومانی باوەڕبوون بە خودا، بڕوا بە شتەکانی سەرووی سروشت و پێوەری خودی بۆ ئاییندارى) پەیوەندیەکی پۆزەتیڤ و مانادارییان لەگەڵ بەختەوەری هەبوو، تەنها پێوەری خودی بۆ ئاییندارى کاریگەری ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەر بەختەوەری، پێوەرەکانی دیکەیش کاریگەرییان هەبوو، بەڵام بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ.

لەژێر ناونیشانی: کێ سوود لە ئایین وەردەگرێت؟ مۆچۆن و نۆڕتۆن و ئاریەلی (Mochon, Norton, Ariely 2011) توێژینەوەیەکیان لەسەر سامپڵێکی گەورە کرد بە مەبەستی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان بەشداربوون لە چالاکییە ئایینیەکان و هەستی کەسەکە بە خۆشحاڵی و ساغی (subjective well-being). رووماڵەکە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە کراو لە ٥٠ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ٦٤٦٥ کەس بەشداری تێدا کرد.

ئەنجامەکانی توێژینەوەکە دەریخست کە پەیوەندییەکی پۆزەتیڤ لە نێوان ئاییندارى و هەستکردن بە خۆشحاڵی هەیە، بەڵام ئەنجامەکە

ئەوەشی دەرخست کە ئەوە کەسانەی ئاستی ئاییندارییان بەرزە سوود لە ئایین وەردەگرن، ئەوانەی بڕوایان لاوازە ئاستی هەستکردن بە خۆشحاڵیان نزمترە لەو کەسانەی بێبڕوان، یان بە گومانن..

حوسێن و هاوڕێکانی (Hussain, Weisaeth & Heir, 2011) توێژینەوەیەکیان کرد بە مەبەستی دۆزینەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی لە بیروباوەڕی ئایینی روودەدات کاتێك کەسەکان ڕووبەڕووی کارەساتی سروشتی دەبنەوە، هەروەها ئامانجی توێژینەوەکە دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییە بوو کە ئاییندارى بە ناڕەحەتی دەروونی دوای کارەسات، یان رازیبوون لە ژیان دەبەستێتەوە.

سامپڵی ئەم توێژینەوەیە لە ١١٨٠ کەسی نەرویجی پێکهات کە رزگاریان ببوو لە تسۆنامی (لافاوی) ساڵی ٢٠٠٤ کە چەند وڵاتێکی لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیای گرتەوە.

ئەنجامی ئەم توێژینەوەیە دەریخست رێژەی ٨٪ لەم کەسانە بیروباوەڕی ئایینیان بەهێز بوو لە دوای ئەم کارەساتەوە، لە بەرانبەر رێژەی ٥٪ کە بیروباوەڕی ئایینیان لاواز بوو، بەهێزبوونی بیروباوەڕی ئایینی پەیوەندی هەبوو بە کێشە دەروونییەکانی ئەم کەسانە لە پێش روودانی سونامی و بوونی فشاری دوای زەبر (الصدمە) لە کاتێکدا لاوازبوونی بیروباوەڕ لای ئەو کەسانە بوو کە بە تەمەن گەنجتر بوون، بە هەمان شێوەش فشاری دوای زەبریان هەبوو.

لە دوای تێپەڕبوونی دوو ساڵ بەسەر ئەم کارەساتەدا، رێژەی ١١٪ لەم رزگاربووانە خۆیان بە کەسانی ئاییندار حسێب دەکەن، بەڵام ئەم

توێژینەوەیە هیچ جیاوازیەکی بەڵگەداری نەدۆزیەوە لە نێوان گرووپە ئاییندار و نائاییندارەکە سەبارەت بە فشاری دوای زەبر و حاڵەتی گشتی نەخۆشی دەروونی و رازیبوون لە ژیاندا، توێژەران گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە بە شێوەیەکی گشتی ئایین ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی ئەو نەرویجیانەدا نەبینیوە کە لە تسۆنامی رزگاریان بووە، ئەو کەسانەی کە زیاتر ڕووبەڕووی ئەم کارەساتە بوونەوە، زیاترین گۆڕان لە بیروباوەڕی ئایینیاندا روویداوە لە هەردوو ئاڕاستەدا، واتە زیادبوون و کەمبوون، هەروەها بیروباوەڕی ئایینی نەبووە ڕێگر لەوەی ئەم کەسانە تووشی ناڕەحەتی دەروونی درێژخایەنی دوای کارەسات نەبن و ئاییندارى پەیوەندی نەبوو بە ئاستێکی بەرزتر لە ڕازیبوون لە ژیانیاندا.

ئامانجی توێژینەوەکەی مایلێڤسکی و لێڤیت ( Milevsky & Levitt 2004) ئەوە بوو کە کاریگەری دوو جۆر لە ئاییندارى (ئایین وەك مەبەست و ئایین وەك ئامراز) هەلسەنگێنێت لای سامپلێك لە مێردمندالآن و هەرزەکاران لە پۆلی شەش تا هەشت و ژمارەیان ٦٩٤ بوو لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەم خوێندکارانە دەربارەی خۆشحاڵی و ئاییندارى کرا. ئەوانەی نمرەیان بەرز بوو لە هەردوو جۆر ئاییندارى، نمرەیان لەسەر هەندێ لە پێوەرەکانی خۆگونجاندنی دەروونی بەرز بوو، بە بەراورد بەوانەی نمرەیان لەسەر ئەم دوو جۆرە ئاییندارییە نزم بوو، کچان نمرەیان لەسەر پێوەری ئاییندارى (ئایین وەك مەبەست) بەرزتر بوو لە کوڕان.

هۆڵدەر و کۆلمان و والاس ( Holder, Coleman and Wallace 2010) توێژینەوەیەکیان لەسەر پەیوەندی ڕۆحانیەت و ئایینداری و بەختیاری لای منداڵان لە تەمەنی ٨ تا ١٢ساڵ کرد، ئەم توێژینەوەیە لەسەر ٣٢٠ منداڵ لە قوتابخانە گشتییەکان (حکومییەکان) و تایبەتەکان (ئایینییەکان) کرا، بێجگە لە منداڵان خۆیان، دایك و باوکانیشیان بەشدارییان لە هەڵسەنگاندنی ئاستی بەختەوەری منداڵەکانیان کرد، ئەنجامی توێژینەوەکە دەریخست کە ڕەهەندی ڕۆحانی منداڵان، نەك پیادەکردنی ئەرکە ئایینییەکان (چوون بۆ کەنیسە، نزا یان نوێژکردن، زیکرکردن)، پەیوەندییەکی بەهێزی بە هەستکردن بە بەختەوەری هەیە، واتە ئەو منداڵانەی ئاستی ڕۆحانیان بەرزتر بوو، بەختەوەرتر بوون.

**مەبەستی سەرەکی لە نووسینی ئەم کتێبە ئەوە بوو خوێنەری کورد ئاشنا بکات بە هەندێ لە بابەتەکانی سایکۆلۆجیای ئایین، بۆیـە بـە پێی توانا هەوڵم داوە کە بە شێوازێکی سادە و ساکار بیرۆکەکان بخەمەڕوو، هەرچەندە ئەمە کارێکی قورسە و نازانم لەمەدا چەند سەرکەتوو بووم.**

## پێشبینی دەکەم کە خوێنەری سەرەکی ئەم کتێبە سێ جۆر بن:

جۆری یەکەم: خوێنەری گشتیین کە حەز دەکەن شتی تازە بخوێننەوە لەسەر کۆمەڵێك لە بابەتەکان. جۆری دووەم: لە خوێنەری ئەم کتێبە ئەو کەسانەن کە خوێنەری کتێبی ئایینین، بە تایبەتی ئیسلامی. جۆری سێیەم: لە خوێنەران ئەو کەسانەن حەز دەکەن بە تایبەتی لەسەر بابەتی سایکۆلۆجی شت بخوێننەوە.

ئەگەر ئەم کتێبە بتوانێت جۆری دووەم و سێیەم لە خوێنەران کۆبکاتەوە، ئەوا کارێکی باشی کردووە.

لەسەرەتا و لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبە هەوڵمدا هەندێ لە زاراوە سەرەکی و گرنگەکان پێناسە بکەم، لێرەدا دوو خاڵ مایەی دووبارە جەختکردنەوەیە:

**یەکەم: پێویستە ئایین لە ئاییینداری جیا بکرێتەوە.**

**دووەم: ناونانی سایکۆلۆجیای ئاییینداری گونجاوترە لە سایکۆلۆجیای ئایین.**

ئەو پێناسەیەی پێشنیازم کرد بۆ ئاییینداری، لە بەشی یەکەمدا، خاڵێکی بنەڕەتی ئەم کتێبەیە و نووسەر بەم شێوەیە لە ئاییینداری دەگات، بێگومان خوێنەریش دەشێ ئەم پێناسەیەی پێ پەسەند نەبێت و پێناسەی خۆی هەبێت، بەڵام زۆر گرنگە خوێنەری هەر کتێبێك بە ڕوونی لە تێگەیشتنی نووسەری کتێبەکە لە چەمکە سەرەکییەکان تێبگات.

لە بەشی دووەمی کتێبەکەدا بۆچوونی هەندێ لە دەروونزانانم سەبارەت بە ئایین و ئاییینداری خستەڕوو، بۆمان دەرکەوت کە جیاوازیان هەیە لە تێگەیشتنیان لە چەمکی ئاییینداری و پۆلێنکردنی، بەڵام بە گشتی، بێجگە لە فرۆید، زۆربەی زۆری دەروونزانە بە ناوبانگەکان پێیانوایە کە ئاییینداری دەشێ سوودی بۆ لایەنی دەروونی مرۆڤ هەبێت. دیارە زۆر دەروونزانی دیکەیش هەن کە لەم بەشەدا ئاماژەمان بۆ بۆچوونەکانیان نەکردووە، بۆ نموونە ئەریك ئەریکسۆن، کارل رۆجەرز و کەسانی دیکەیش، هۆیەکەشی ئەوە بوو کە نەمدەویست کتێبەکە گەورەتر بێت لەلایەك و لە لایەکی دیکەوە، بە شێوەیەکی گشتی ئەوانەی کە باسی بۆچوونەکانیشمان نەکردن، بۆچوونێکی جیاوازیان نییە لەگەڵ ئەوانەی کە باسمانکردن.

له بەشی سێییەمی ئەم کتێبەدا باسمان لە گەشەکردنی ئایینداری کرد بە پێی قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ، بە گشتی توێژینەوەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە گۆڕانگاری بەسەر ئاست و جۆری ئاییندارییدا دێت لە قۆناغەکانی تەمەندا.،هەندێکیان بڕوایان وایە هەرچەندە مرۆڤ لە ڕووی تەمەنەوە گەشە بکات، لە ڕووی ئاییندارییشەوە گەشە دەکات، بەڵام هەندێکی دیکە لە توێژەران پێیانوایە مەرج نییە لەگەڵ گەشەکردنی تەمەن، ئاییندارییش گەشە بکات، بەڵکو لەوانەیە لە تەمەنێکی دیارییکراودا، ئاییندارى بوونى نەمێنێت، شتێکی تازە نادرکێنم ئەگەر بڵێم توێژینەوەمان لەسەر ئەم بابەتە لە کۆمەڵگای کوردی نییە!

بەشی چوارەمی ئەم کتێبە دەربارەی چۆنیەتی پێوانی ئاییندارى بوو، هەوڵدرا بە کورتی باس لە هەندێ لەم پێوەرانە بکرێت، بە تایبەتی ئەوانەی بۆ کۆمەڵگای موسڵمانان ئامادە کراون، هەروەها ئاماژە بە هەندێ لەم کێشانە کرا کە ڕووبەڕووی پرۆسەی پێوانی ئاییندارى دەبێتەوە، ئینجا نووسەر باسی چۆنیەتی دروستکردنی پێوەرێك بۆ پێوانی ئاییندارى لای تاکی کوردی موسڵمان، کرد.

لە کۆتایی ئەم بەشەشدا، نووسەر هەوڵیدا پۆلێنکردنێك پێشنیاز بکات بە پشتبەستن بە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز، مەبەست لە پێشکەشکردنی ئەم پۆلێنە قورئانییە، وەنەبێ شتێکی یەکلاکەرەوە بێت، بەڵکو بۆ ئەوەیە ببێتە بابەتێکی گفتوگۆ و توێژینەوە، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی گرنگی بە ئاییندارى لای موسڵمانان دەدەن.

لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبە، پەیوەندی نێوان ئایینداری و دەروون ڕوونکراوەتەوە، ئەم بەشە درێژترین بەشی کتێبەکەیە و لەوانەیە بۆ هەندێ کەس گرنگترین بەشی بێت، چونکە بۆ هەندێ لە خوێنەرەکان، ئەوەی لایان گرنگە بزانن، سروشتی ئەو پەیوەندییە چۆنە؟ بە شێوەیەکی گشتی و بێ چوونە نێو وردەکارییەکان، توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن ئەو کەسانەی کە ئاستی ئایینداریان بەرزە، ئاستی دڵەڕاوکێ و خەمۆکی و ناڕەحەتی دەروونیان نزمترە، هەروەها ئەوانەی ئاستی ئایینداریان بەرزە، ئاستی خۆشحاڵی دەروونی و بەختەوەریان بەرزە.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان کێشەکانی ئالوودەبوون و خۆکوشتن، توێژینەوەکان بەرەو ئەو ئاڕاستەن کە ئایینداری ڕێگرە بۆ زۆربەی خەڵك لە بەردەم تووشبوون بە ئالوودەبوون، بە تایبەتی ماددە هۆشگۆڕەکانی وەك ئەلکحول، هەروەها لەبەردەم خۆکوشتن، سەبارەت بە کێشەکانی خێزانیش، توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە هاوسەری ئاییندار کەمتر تووشی کێشەی خێزان دەبن بە بەراورد بە هاوسەری نائاییندار.

بە شێوەیەکی گشتی، ئەنجامی ئەم توێژینەوانەی کە باس کران ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئایینداری سوودی بۆ کەسی ئاییندار و خێزانەکەی هەیە، هەندێ لە توێژینەوەکان ئاماژە بۆ جۆرێکی تایبەت لە ئایینداری دەکەن کە ناویان لێناوە ئایینداری جەوهەری، یان ڕاستەقینە، یان پێگەیشتوو، هەندێ لە خوێنەران، لەوانەیە لەبەر

هەندێ هۆکاری ئایدیۆلۆجی، یان هەر هۆکارێکی دیکەی سایکۆلۆجی، گومان بخەنە سەر ئەم ئەنجامانە. دیارە ئەوە مافی خۆیانە و کەس ناتوانێت بیرۆکەیەك لەسەر ئەوانی دیکە بسەپێنێت، ئەگەرچی ئەم بیرۆکەیەش بە توێژینەوە پشتڕاست کرابێتەوە، بەڵام هیوا دەخوازم کە خوێنەر بە بیرێکی فراوان و بێلایەنانە مامەڵە لەگەڵ کتێبەکەدا بکات.

ئەوەی ڕاستی بێت، زۆر بابەتی دیکە هەن لە بواری سایکۆلۆجیای ئایین، یان ئایینداری کە ئەم کتێبە باسی نەکردوون، بۆ نموونە پەیوەندی ئایینداری بە جۆری کەسایەتی، دیاردەی ئایین گۆڕین و سایکۆلۆجیای پەرستشەکان وەك: دوعاکردن، نوێژکردن، بەڕۆژووبوون و هیتر بابەتی هۆکارەکانی ئایینداری و پەیوەندی ئایینداری بە کێشە و نەخۆشییە جەستەییەکان، هۆکاری سەرەکی فەرامۆشکردنی ئەم بابەتانە ئەوە نییە کە گرنگ نین، یان توێژینەوەیان لەسەر نەکراوە، بە پێچەوانەوە. دوو هۆی سەرەکی هەن:

**یەکەم:** حەزم نەکرد قەبارەی کتێبەکە گەورە بێت، چونکە مرۆڤی سەردەم کاتی ئەوەی نەماوە کتێبی قەبارە گەورە بخوێنێتەوە!

**دووەم:** ئامانج لە نووسینی ئەم کتێبە ئەوە بوو بۆ ئەوەی ببێتە پێشەکییەك لەسەر بابەتی سایکۆلۆجیای ئایین، کە من بە زمانی کوردی هیچ کتێبێکم نەبینییوە کە لەسەری نووسرا بێت، لەم حاڵەتەدا نووسەر ناتوانێ هەموو بابەتەکان باس بکات، بەڵکو هەوڵ دەدات هەندێ لە بابەتە سەرەکییەکان باس بکات و بابەتەکانی دیکە بۆ توێژەر و

نووسەرانی دیکە بەجێدێلێت، یان خۆی لە دەرفەتێکی دیکەدا باسیان دەکات.

ئەوەی جیاوازە لەم کتێبە، کە بێگومان خوێنەری هێژا تێبینی کردووە، پشتبەستنی زۆر بە توێژینەوە و دوورکەوتنەوە لە قسەکردنی تیۆری لەسەر بابەتەکان، لەم کتێبە پشت بە ٧٥ توێژینەوەی زانستی بەستراوە کە بە پێی زانیاری خۆم هیچ کتێبێکم نەبینیووە بە زمانی کوردی کە ئەوەندە توێژینەوە بگرێتە خۆی. شتێکی ئاشکرایە کە قسەکردنی زانستی لەسەر هەر بابەتێك لە بابەتەکان، ناکرێ تەنها بە شێوەیەکی تیۆری بێت و هەر کەسێك ڕا و بۆچوونێکی خۆی لەسەر بابەتەکە هەبێت و بە زانستی لە قەڵەمی بدات، قسەکردنی زانستی دەبێت پشتئەستوور بێت بە توێژینەوەی زانستی تۆکمە، مەرج نییە ئەنجامی هەموو توێژینەوەکان بە یەك ئاڕاستە بن، بەڵام جیاوازی نێوانیانیش دەکرێ بە شێوەیەکی لۆجیکی لێکبدرێتەوە و لە کۆتاییدا بگەینە ئەنجامێکی دڵنیاکەرەوە سەبارەت بە بابەتەکە، بۆیە هیوادارم کە خوێنەر لە زۆری توێژینەوەکانی ناو ئەم کتێبە بێزار نەبێت، بەڵکو هەوڵ بدات سوودیان لێ ببینێت و ئەگەر خوێنەر توێژەریش بوو هیوادارم کە ئەم توێژینەوانە دەرگایان بۆ بکەنەوە بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی هاوشێوە لە کۆمەڵگای کوردیدا.

هەوڵم داوە کە بە باشی و بە شێوەیەکی زانستی ئاماژە بۆ سەرچاوە توێژینەوەکان بدەم لە بەشی سەرچاوەکان بۆ ئەوەی خوێنەر بە ئاسانی بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی سەرەکی توێژینەوەکە ئەگەر

ویستی زانیاری وردتر لەسەر توێژینەوەکە بزانێت، بە تایبەتی لەسەر چۆنیەتی ئەنجامدانی و ئەو پێوەرانەی کە تیایاندا بەکارهاتوون.
ئومێدەوارم کە ئەم کتێبە سەرەتایەك بێت بۆ نووسینی کتێبی دیکە لەسەر ئەم بابەتە هەستیارە وهاندەرێك بۆ ئەکادیمییەکان کە توێژینەوەی زانستی لەسەر بابەتەکانی سایکۆلۆجیای ئایینداری بکەن و پێشنیاز دەکەم کە ئەو لایەنانەی پەیوەندییان بە کاروباری ئایینی هەیە لە هەرێمی کوردستان، چ وەرزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی بێت، یان یەکێتی زانایانی کوردستان بێت، بیر لە دامەزراندنی سەنتەرێکی زانستی بکەنەوە، بە هاوکاری زانکۆکانی هەرێم، کە تایبەت بێت بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی لەسەر سایکۆلۆجیا و سۆسیۆلۆجیای ئایینداری لە کوردستاندا.

وەك یەکەم کتێب کە لەسەر سایکۆلۆجیای ئایینداری بە کوردی نووسرابێت و وەك هەر هەولێکی مرۆڤ، چاوەڕێی ئەوە دەکەم کەموکورتی و هەڵەی تێدا بێت، زۆر سوپاسگوزار دەبم ئەگەر خوێنەران لەم کەموکورتی و هەڵانە ئاگادارم بکەنەوە بۆ ئەوەی بتوانم لە چاپی داهاتوودا خۆم لێیان بپارێزم.

# سەرچاوەکان

## بە زمانی ئینگلیزی:

Abdel-Khalek, A. M. (2006). Happiness, health, and religiosity: Significant relations.
*Mental Health, Religion & Culture*, 9(1): 85–97.

Abdel-Khalek, A. M. (2007). Assessment of intrinsic religiosity with a single-item measure in a sample of Arab Muslims, Journal of Muslim Mental Health, 2 (2): 211 – 215.

Abdel-Khalek, A. M. & Naceur, F. (2007). Religiosity and its association with positive and negative emotions among college students from Algeria, *Mental Health, Religion & Culture*, 10(2): 159–170

Abu Raiya, H. (2008). A psychological measure of Islamic religiousness: Evidence for relevance, reliability and validity. Unpublished PhD Dissertation. Bowling Green State University.

Achour, M. , Grine, F. , Mohd Nor, M. R. , & Mohd Yusoff, M. Y. Z. (2014). Measuring religiosity and its effects on personal well-being: A case study of Muslim female academicians in Malaysia. Journal of Religion and Health, DOI 10. 1007/s10943-014-9852-0.

Agbaria, Q. (2013) Depression among Arab students in Israel: The contribution of religiosity, happiness, social support and self-control. Sociology Study. 3 (10): 721-738.

Ai, A. L. , Peterson, C. & Huang, B. (2003). The Effect of Religious–Spiritual Coping on Positive Attitudes of Adult Muslim Refugees From Kosovo and Bosnia, *The International Journal for the Psychology of Religion*, 13(1), 29–47.

Albelaikhi, A. A. (1997). Development of a Muslim religiosity scale. Dissertations and Master's Theses (CampusAccess). http://digitalcommons. uri. edu/dissertations/ AAI9805228.

Allport, G. W. (1950). *The Individual and his religion: A Psychological Interpretation*. New York: The Macmillan Company.

Anderson, M. J. , Marwit, S. J. , Vandenberg, B. & Chibnall, J. T. (2005). Psychological and Religious Coping Strategies of Mothers Bereaved by the Sudden Death of a Child, *Death Studies*, 29: 811–826.

Ardelt, M. (2003). Effects of Religion and Purpose in Life on Elders' Subjective Well-Being and Attitudes toward Death. *Journal of Religious Gerontology*, Vol. 14(4).

Argyle, M. (2000). *Psychology and Religion: An Introduction*. Routledge: London and New York

Aten, J. D. , O'Grady, K. A. & Worthington JR, E. L. (2012). *The Psychology of Religion and Spirituality for Clinicians: Using Research in Your Practice*. New York: Routledge

Belding, J. N. , Howard, M. G. , McGuire, A. M. , Schwartz, A. C. & Wilson, J. H. (2010). Social Buffering by God: Prayer and Measures of Stress, *Journal of Religion and Health*, 49:179–187.

Belzen, J. A. (2010). *Towards Cultural Psychology of Religion: Principles, Approaches, Applications*. London: Springer.

Bjorck, J. P. & Thurman, J. W. (2007). Negative Life Events, Patterns of Positive and Negative Religious Coping, and Psychological Functioning, *Journal for the Scientific Study of Religion*, 46(2):159–167.

Bootzin, R. R. , Acocella, J. R. & Alloy, L. B (1993) Abnormal Psychology: Current Perspectives. 6th ed. New York: McGraw-Hill.

Boswell, G. H. , Kahana, E. and Anderson, P. D. (2006). Spirituality and Healthy Lifestyle Behaviors: Stress Counter-balancing Effects on the Well-being of Older Adults, *Journal of Religion and Health*, 45 (4): 587-602.

Brown, S. L. , Nesse, R. M. , House, J. S. & Utz, R. L. (2004). Religion and Emotional Compensation: Results From a Prospective Study of Widowhood, *Personality and Social Psychology Bulletin*, 30; 1165-1174.

Butcher, J. N. , Mineka, S. & Hooly, J. M. (2008). Abnormal Psychology: Core Concepts. Boston: Pearson.

Carlozzi, B. L. , Winterowd, C. , Harrist, R. S. , Thomason, N. , Bratkovich, K. & Worth, S. (2010). Spirituality, Anger, and Stress in Early Adolescents, *Journal of Religion and Health*, 49:445–459.

Chaaya, M. , Sibai, A. M. , Fayad, R. and El-Roueiheb, Z. (2007). Religiosity and depression in older people: Evidence from underprivileged refugee and non-refugee communities in Lebanon. *Aging Mental Health,* 11(1): 37–44.

Chen, Z. , Ghorbani, N. , Watson, P. J. & Aghababaei, N. (2013). Muslim experiential religiousness and Muslim attitudes toward religion: Dissociation of experiential and attitudinal aspects of religiosity in Iran. Studia Religiologica, 46 (1): 41–50.

Chiswick, B. R. & Mirtcheva, D. M. (2013). Religion and Child Health: Religious Affiliation, Importance, and Attendance and Health Status among American Youth.
*Journal of Family Economic Issues*, 34:120–140.

Chamberlain, T. J. & A. Hall, C. A. (2000). *Realized Religion*. Philadelphia & London:
Templeton Foundation Pres

Chuin, C. L. & Choo, Y. C. (n. d. ). Age, Gender, and Religiosity as Related to Death Anxiety, Sunway Academic Journal, 6.

Colbert, L. K. , Jefferson, J. L. , Gallo, R. & Davis, R. (2009). A Study of Religiosity and Psychological Well-being Among African Americans: Implications for Counseling and Psychotherapeutic Processes, *Journal of Religion and Health*, 48:278–289.

Cowchock, F. S. , Lasker, J. N. , Toedter, L. J. , Skumanich, S. A. & Koenig, H. G. (2010). Religious Beliefs Affect Grieving After Pregnancy Loss, *Journal of Religion and Health*, 49:485–497.

Daaleman,T. P. , Perera, S. and Studenski,S. A. *(2004)*. Religion, Spirituality, and Health Status in Geriatric Outpatients. *Annual Family Medicine,* Vol. 2:49-53.

Dacey, J. , Travers, J. & Fiore, L. (2009). *Human Development across Life Span*. New York: McGraw-Hill International Edition.

Delaney, H. D. , Miller, W. R. & Bisono´, A. M. (2007). Religiosity and Spirituality Among Psychologists: A Survey of Clinician Members of the American Psychological Association. *Professional Psychology: Research and Practice*, 38 (5): 538–546.

Dew, R. E. , Daniel, S. S. , Goldston, D. B. , McCall, W. V. , Kuchibhatla, M. , Schleifer, C. , Triplett, M. F. & Koenig, H. G. (2010). A prospective study of religion/spirituality and depressive symptoms among adolescent psychiatric patients, *Journal of Affective Disorders*, 120: 149–157.

Dulin, P. L. (2005). Social support as a moderator of the relationship between religious participation and psychological distress in a sample of community dwelling older adults, *Mental Health, Religion & Culture*, 8(2): 81-86.

Eliassen, A. H. , Taylor, J. & Lloyd, D. A. (2005). Subjective Religiosity and Depression in the Transition to Adulthood, *Journal for the Scientific Study of Religion*, 44(2):187–199.

Ellis, A. (n. d. ). *The Case Against Religion: A Psychotherapist's View and The Case Against Religiosty*. Austin: American Atheist Press

Ellis, A. (1992). Do I Really Hold That Religiousness Is Irrational and Equivalent to Emotional Disturbance? *American Psychologist*, March, p. 428.

El-Menouar, Y. (2014). The five dimensions of Muslim religiosity: Results of an empirical study. Methods, Data, Analyses, 8(1): 53-78.

Eskin, M. (2004). The effects of religious versus secular education on suicide ideation and suicidal attitudes in adolescents

in Turkey, *Social Psychiatry and Psychiatric Epidemiology*, 39 : 536–542.

Ferguson, J. K. , Willemsen, E. W. & Castañeto, M. L. V. (2010). Centering Prayer as a Healing Response to Everyday Stress: A Psychological and Spiritual Process,
*Pastoral Psychology*, 59:305–329.

Fincham, F. D. , Beach, S. R. H. , Lambert, N. , Stillman, T. & Braithwaite, S. (2008). Spiritual Behaviors and Relationship Satisfaction: A Critical Analysis of the Role of Prayer. *Journal of Social and Clinical Psychology*, 27 (4): 362–388.

Francis, L. J. & Jackson, C. J. (2003). Eysenck's dimensional model of personality and religion: are religious people more neurotic? *Mental Health, Religion & Culture*, 6 (1): 87-98.

Francis, J. L. , Fearn, M. and Lewis, C. A. (2005). The Impact of Personality and Religion on Attitudes toward Alcohol among 16–18 year olds in Northern Ireland. *Journal of Religion and Health*, Vol. 44 (3).

Frazier, C. , Mintz, L. B. & Mobley, M. (2005). A Multidimensional Look at Religious Involvement and Psychological Well-Being Among Urban Elderly African Americans, *Journal of Counseling Psychology*, 52 (4): 583–590.

French, D. C. , Eisenberg, N. , Vaughan, J. , Purwono, U. & Suryanti, T. A. (2008).
Religious Involvement and the Social Competence and Adjustment of Indonesian Muslim Adolescents, *Developmental Psychology*. 44 (2): 597–611.

Freud, S. (1961). *Future of an illusion*. James Strachey (trans. ). New York: W. W. Norton & Company Inc.

Fry, P. S. (2000). Religious involvement, spirituality and personal meaning for life: existential predictors of psychological wellbeing in community residing and institutional care elders, *Aging & Mental Health*, 4(4): 375- 387

Ghorbani, N. , Watson, P. J. , Ghramaleki, F. A. , Morris, R. J. & Hood, R. W. Jr. (2000). Muslim attitudes towards religion scale: factors, validity and complexity of relationships with mental health in Iran, *Mental Health, Religion & Culture*, 3 (2): 125-132.

Good, M. & Willoughby, T. (2006). The Role of Spirituality Versus Religiosity in Adolescent Psychosocial Adjustment, *Journal of Youth and Adolescence*, 35(1): 41–55.

Green, M. & Elliott, M. (2010). Religion, Health, and Psychological Well-Being, *Journal of Religion and Health*, 49:149–163.

Haley, K. C. , Koenig, H. G. & Bruchett, B. M. (2001). Relationship between Private Religious Activity and Physical Functioning in Older Adults, *Journal of Religion and Health*, 40 (2): 305-312.

Harding, S. R. , Flannelly, K. J. , Weaver, A. J. & Costa, K. G. (2005). The influence of religion on death anxiety and death acceptance, *Mental Health, Religion & Culture,*
8(4): 253–261

Harris, J. I. , Schoneman, S. W. & Carrera, S. R. (2002). Approaches to religiosity related to anxiety among college students, *Mental Health, Religion & Culture*, 5 (3): 253-265.

Higginbotham, B. J. , Ketring, S. A. , Hibbert, J. , Wright, D. W. & Guarino, A. (2007). Relationship Religiosity, Adult

Attachment Styles, and Courtship Violence Experienced by Females, *Journal of Family Violence*, 22:55–62.

Holder, M. D. , Coleman, B. & Wallace, J. M. (2010). Spirituality, Religiousness, and Happiness in Children Aged 8–12 Years. *Journal of Happiness Studies*, 11:131–150

Hood, R. W. , Hill, P. C. & Spilka, B. (2009). *The Psychology of Religion: An Empirical Approach.* 4th ed. New York: Guilford Press

Horton, K. D. , Ellison, C. G. , Loukas, A. , Downey, D. L. & Barrett, J. B. (2012). Examining Attachment to God and Health Risk-Taking Behaviors in College Students. *Journal of Religion and Health*, 51:552–566

Hossain, M. S. & Siddique, M. Z. (2008). Does Religiosity Help Muslims Adjust to Death: A Research Note, *Omega*, 57(1): 113-119.

Hunsberger, B. , Pratt, M. & Pancer, S. M. (2001). Religious Versus Nonreligious Socialization: Does Religious Background Have Implications for Adjustment? *The International Journal for the Psychology of Religion*, 11(2): 105–128.

Hussain, A. , Weisaeth, L. & Heir, T. (2011). Changes in religious beliefs and the relation of religiosity to posttraumatic stress and life satisfaction after a natural disaster, *Social Psychiatry and Psychiatric Epidemiology*, 46:1027–1032.

Hood, R. W. , Hill, P. C. & Spilka, B. (2009). *The psychology of religion : an empirical approach*. 4th. ed. New York: Guilford Press.

Jacobs, M, Miller, L. , Wickramaratne, P. , Gameroff, M. , & Weissman, M. M. (2012). Family religion and psychopathology

in children of depressed mothers: Ten-year follow-up, *Journal of Affective Disorders*, 136: 320–327.

Jagt-Jelsma, W. , Vries-Scho, M. , Jong, R. , Verhulst, F. C. , Ormel, J. , Veenstra, R. , Swinkels, S. & Buitelaar, J. (2011). The relationship between parental religiosity and mental health of pre-adolescents in a community sample: the TRAILS study. *European Child and Adolescent Psychiatry*, 20:253–260.

James, W. (n. d. ). The Variety of Religious Experience: A Study in Human Nature. World Wide Web.

Johansen, T. (2010). *Religion and Spirituality in Psychotherapy: An Individual Psychology Perspective*. New York: Springer Publishing Company.

Jung, C. G. (1958). *Psychology and Religion: West and East*. Trans. R. F. C. Hull. New York: Banthion Books.

Kalkhoran, M. A. & Karimollahi, M. (2007). Religiousness and preoperative anxiety: a correlational study, *Annals of General Psychiatry*, 6:17doi:10. 1186/1744-859X-6-17.

Kamal, Z. and Loewnthal, K. M. (2002). Suicide beliefs and behaviour among young Muslims and Hindus in the UK, *Mental Health, Religion & Culture*, 5 (2).

Kaslow, N. J. , Price, A. W. , Wyckoff, S. , Grall, M. B. Sherry, A. , Young, S. , Scholl, L. , Upshaw, V. M. , Rashid, A. Jackson, E. B. & Bethea, K. (2004). Person Factors Associated With Suicidal Behavior Among African American Women and Men. *Cultural Diversity and Ethnic Minority Psychology*, 10 (1): 5–22.

Kendler, K. S. , Liu, X-Q. , Gardner, C. O. , McCullough, M. E. , Larson, D. & Prescott, C. A. (2003). Dimensions of

Religiosity and Their Relationship to Lifetime Psychiatric and Substance Use Disorders. *American Journal of Psychiatry*, 160:496–503.

Khan, Z. H. & Watson, P. J. (2006). Construction of the Pakistani Religious Coping Practices Scale: Correlations With Religious Coping, Religious Orientation, and Reactions to Stress Among Muslim University Students, *The International Journal for the Psychology of Religion*, 16(2): 101– 112.

Kim, J. (2008). The Protective Effects of Religiosity on Maladjustment among
Maltreated and Nonmaltreated Children. *Child Abuse and Neglect*, 32(7): 711–720

Kirkpatrick, L. A. (2005). *Attachment, Evolution, and the Psychology of Religion*. New York: The Guilfort Press.

Krauss, S. E. , Hamzah, A. , Juhari, U. & Abd. Hamid, A. (2005). The Muslim Religiosity-Personality Inventory (MRPI): Towards understanding differences in the Islamic religiosity among the Malaysian youth. Pertanika Journal of Social Science & Humnities, 13 (2): 173-186.

Labbe´ E. E. & Fobes, A. (2010). Evaluating the Interplay Between Spirituality, Personality and Stress, *Applied Psychophysiological Biofeedback*, 35:141–146.

Laurencelle, R. M. , Abell, S. C. & Schwartz, D. J. (2002). The Relation Between Intrinsic Religious Faith and Psychological Well-Being, *The International Journal For The Psychology of Religion*, 12(2): 109–123.

Lawler, K. A. & Younger, J. W. (2002). Theobiology: An Analysis of Spirituality, Cardiovascular Responses, Stress, Mood,

and Physical Health, *Journal of Religion and Health*, 41 (4): 347-362.

Leuba, J. H. (1909). Psychological Origin and the Nature of Religion. London: Archibald Constable & Co Lt.

Levin, J. (2013). Religion Among Israeli Jews: Findings from the ISSP Religion III Survey, *Journal of Happiness Studies*, DOI 10. 1007/s10902-013-9437-8.

Lewis, C. A. , Francis, L. J. & Enger, T. (2004). Personality, prayer and church attendance among a sample of 11 to 18 year olds in Norway, *Mental Health, Religion & Culture*, 7 (3): 269–274.

Lewis, C. A. , Maltby, J. & Day, L. (2005). Religious orientation, religious coping and happiness among UK adults. *Personality and Individual Differences*, 38: 1193–1202

Lichter D. T. and Julie H. Carmalt, J. H. (2009). Religion and marital quality among low-income couples. *Social Science Research,* 38: 168–187.

Loewenthal, K. M. , Cinnirella, M. , Evodka, G. , & Murphy, P. (2001). Faith conquers all? Beliefs about the role of religious factors in coping with depression among different cultureal-religious groups in the UK, *British Journal of Medical Psychology*, 74: 293-303.

Loewenthal, K. (2006). *Religion, Culture and Mental Health*. Cambridge: Cambridge University Press.

Mahmoudi, G. , Ebadi, A. G. & Akbarzadeh, H. (2007). Religious Coping and Anxiety in Students of Islamic Azad University-Sari Branch, 1999-2000, *World Applied Sciences Journal*, 2 (4): 363-367.

Maslow, A. H. (1964). *Religions, Values, and Peak Experiences*. Penguin Books Limited.

Maselko, J. & Buka, S. (2008). Religious activity and lifetime prevalence of psychiatric disorder, *Social Psychiatry and Psychiatric Epidemiology*, 43:18–24.

Meisenhelder, J. B. Chandler, E. N. (2002). Spirituality and Health Outcomes in the Elderly, *Journal of Religion and Health*, 41 (3): 243-252.

Milevsky, A. & Levitt, M. J. (2004). Intrinsic and extrinsic religiosity in preadolescence and adolescence: Effect on psychological adjustment, *Mental Health, Religion & Culture*, 7 (4): 307–321.

Milevsky, A. & Leh, M. (2008). Religiosity in Emerging Adulthood: Familial Variables and Adjustment, *Journal of Adult Development*, 15:47–53.

Mochon, D. , Norton, M. I. & Ariely, D. (2011). Who Benefits from Religion?
*Social Indicators Research,* 101:1–15

Mykito, J. J. & Knight, S. J. (1999). Body, Mind and Spirit: Towards the Integration of Religiosity and Spiritualtiy in Cancer Quality of Life Research, *Psycho-Oncology*, 8: 439–450.

Nelson, J. M. (2009). *Psychology, Religion, and Spirituality*. New York: Springer

Nielsen, S. L. , Johnson, W. B. & Ellis, A. (2001). *Counseling and Psychotherapy with Religious Persons: A Rational Emotive Behavior Therapy Approach.* New Jersey: Lawrence Erlbaum Associates, Publishers.

Park, C. L. (2006). Exploring relations among religiousness, meaning, and adjustment to lifetime and current stressful encounters in later life, *Anxiety, Stress, and Coping*, 19(1): 33-45.

Parker, M. L. , Roff, L. , Klemmack, D. L. , Koenig, H. G. , Baker, P. & Allman, R. M. (2003). Religiosity and mental health in southern, community-dwelling older adults, *Aging & Mental Health*, 7(5): 390–397.

Peselow, E. , Pi, S. , Lopez, E. , Besada, A. , & Ishak, W. W. (2014). The Impact of Spirituality Before and After Treatment of Major Depressive Disorder. *Innovations in Clinical Neuroscience*, 11(3–4):17–23.

Perez, J. E. , Little, T. D. , & Henrich, C. C. (2009). Spirituality and Depressive Symptoms in a School-Based Sample of Adolescents: A Longitudinal Examination of Mediated and Moderated Effects, *Journal of Adolescent Health*, 44: 380–386.

Plante, G. T. , Yancey, S. , Sherman, A. and Guertin, M. (2000). The Association Between Strength of Religious Faith and Psychological Functioning, *Pastoral Psychology*, 4( 5): 405-412.

Rajagopal, D. , Mackenzie, E. , Bailey, C. and Mourey, R. L. (2002). The Effectiveness of a Spiritually-Based Intervention to Alleviate Subsyndromal Anxiety and Minor Depression among Older Adults*, Journal of Religion and Health*, 41 (2):153-166.

Rasic, D. , Kisely, S. and Langille, D. B. (2011). Protective associations of importance of religion and frequency of service attendance with depression risk, suicidal behaviours and substance use in adolescents in Nova Scotia, Canada, *Journal of Affective Disorders,* 132: 389–395.

Rasic, D. , Robinson, J. A. , Bolton, J. , Bienvenu, O. J. , & Sareen, J. (2011). Longitudinal relationships of religious worship attendance and spirituality with major depression, anxiety disorders, and suicidal ideation and attempts: Findings from the Baltimore epidemiologic catchment area study. *Journal of Psychiatric Research*, 45: 848-854.

Robu, M. (2006). The Relationship Between Religiousness, Attachment and Psychological Wll-being, *Studia Universitatis Babes-Bolyai, Theologia Catholica Latina*, Li, 1: 83-92.

Rostosky, S. S. , Danner, F. and Riggle, E. D. B. (2008). Religiosity and Alcohol Use in Sexual Minority and Heterosexual Youth and Young Adults, *Journal of Youth and Adolescence*, 37:552–563

Salleh, M. S. (2012). Religiosity in development: A theoretical construct of an Islamic-based development. International Journal of Humanities and Social Science, 2(14):266-274.

Salsman, J. M. & Carlson, C. R. (2005). Religious Orientation, Mature Faith, and Psychological Distress: Elements of Positive and Negative Associations, *Journal for the Scientific Study of Religion*, 44(2):201–209.

Sarason, I. G. & Sarason, B. R. (1996). Abnormal Psychology: The Problem of Maladaptive Behavior. New Jersey: Prentice-Hall.

Saroglou, V. (2011). Believing, bonding, behaving, and belonging: The big four religious dimensions and cultural variation, Journal of Cross-Cultural Psychology, 42(8) 1320–1340.

Schultz, D. P. & Schultz, S. E. (2005). *Theories of Personality*. 8th ed. Belmont: Thomson Wadsworth.

Seidmahmoodi, J. , Rahimi, C. & Mohamadi, N. (2011). Resiliency and Religious Orientation: Factors Contributing to Posttraumatic Growth in Iranian Subjects, *Iranian Journal of Psychiatry*, 6:145-150.

Smith, T. B. , McCullough, M. E. & Poll, J. (2003). Religiousness and Depression: Evidence for a Main Effect and the Moderating Influence of Stressful Life Events. *Psychological Bulletin*, 129 (4): 614–636.

Steger, M. F. & Frazier, P. (2005). Meaning in Life: One Link in the Chain From Religiousness to Well-Being, *Journal of Counseling Psychology*, 52 (4): 574–582.

Van Bruinessen, M. (1999). The Kurds and Islam. Working Paper no. 13, Islamic Area Studies Project, Tokyo, Japan,

Walker, C. , Ainette, M. G. , Wills, T. A. & Mendoza, D. (2007). Religiosity and Substance Use: Test of an Indirect-Effect Model in Early and Middle Adolescence, *Psychology of Addictive Behaviors*, 21 (1): 84–96.

Webb, M. & Whitmer, K. J. O. (2003). Parental religiosity, abuse history and maintenance of beliefs taught in the family, *Mental Health, Religion & Culture*, 6 (3): 229-239.

Whitbourne, S. K. & Whitbourne, S. B. (2011). *Adult Development & Aging: Biopsychosocial Perspective.*. 4th ed. John Wiley & Sons.

Wnuk, M. & Marcinkowski, J. T. (2014). Do Existential Variables Mediate Between Religious-Spiritual Facets of Functionality and Psychological Well-being. *Journal of Religion and Health*, 53:56–67.

Wulff, D. M. (2001). Psychology of religion: An overview. In: *Religion and Psychology:*

*Mapping the Terrain: Contemporary dialogues, future prospects*. Edited by: Jonte-Pace, D. and B. Parsons, W. B. London: Routledge

Zuraida, N. Z. & Ahmad, H. S. (2007). Religiosity and Suicide Ideation in Clinically Depressed Patients, *Malaysian Journal of Psychiatry*, 16 (1).

Zwingmann, C. , Wirtz, M. , Muller, C. , Korber, J. & Murken, S. (2006). Positive and Negative Religious Coping in German Breast Cancer Patients, *Journal of Behavioral Medicine*, 29 (6): 533-547.

## به زمانی عەرەبی:

اسماعيل، أزاد علي (٢٠١٤). الدين والصحة النفسية. هيرندن: المعهد العالمي للفكر الاسلامي.

اسماعيل، ازاد علي (٢٠١٦). البعد الغائب: الدين في العلاج النفسي. مقال في جريدة الصباح، صفحة الثقافة النفسية.

البرِواري، رشيد حسين (٢٠١٣) الأفكار العقلانية واللاعقلانية وعلاقتها بالالتزام الديني ومركز الضبط عند طلبة الجامعة. عمان: دار جرير للنشر.

سميث، هيوسن (٢٠٠٥). لماذا الدين ضرورة حتمية؟ مصير الرِؤح الانسانية في عصر الالحاد. تعريب: سعد روستم. دار الجسور الثقافية.

السواح، فارس (٢٠٠٢). دين الانسان: بحث في ماهية الدين ومنشأ الدافع الديني. ط٤. دمشق: دار علاء الدين.

صالح، قاسم حسين (٢٠٠٥). علم النفس الشواذ والاضطرابات العقلية والنفسية. أربيل: مطبعة جامعة صلاح الدين.

عبدالرحمن، طه (٢٠١٦) من الانسان الأبتر الى الانسان الكوثر. بيروت: المؤسسة العربية للفكر والابداع.

فروم، اريك (٢٠٠٣). الدين والتحليل النفسي. ترجمة: فؤاد كامل. الاسكندرية: مكتبة الغريب.

## به زمانی کوردی:

ئازاد علی اسماعیل و میران محمد صالح (٢٠١٤). خەسڵەتە سەرەکییەکانی کەسایەتی کوردی بە بۆچوونی مامۆستایانی زانکۆ. گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە ٣٠، لا: ٣٣٧–٣٦٨.

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی



دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خالانەی خوارەوە بکات:

- فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

- گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

- چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاڕاستەکردنی کاروانی ژیاریی مرۆڤایەتی و بەرچاوڕۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە، هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

- بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

- هاوکاریی هەوڵ و کۆششی زانا توێژەرەوەکانی زانکۆ و بنکەکانی توێژینەوەی زانستیی و بڵاوکردنەوەی بەرهەمە زانستییە نایابەکان.

- ئاڕاستەکردنی توێژینەوە زانستی و ئەکادیمییەکان لەپێناو خزمەتکردن بە فیکر و مەعریفە.

هەروەها پەیمانگا چەند نووسینگە و لقێکی لە پایتەختی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و وڵاتانی تریش هەیە، کە لە ڕێگەیانەوە کار و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی خۆی ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ ژمارەیەك زانکۆی عەرەبی و ئیسلامیی و خۆرئاوایی لە سەرانسەری جیهاندا بۆ هاوکاریی زانستی هاوبەش، هەیە.

# سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی




سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هزر و بیری ڕەسەن و قووڵ بنچینەی تێگەیشتنی ڕاست و دروستە بۆ دەقەکانی قورئان سوننەت و دەستەبەری لێکدانەوەی گونجاوە بۆیان، سەنتەر هەوڵی ڕەخساندنی کەشوهەوای گونجاو دەدات بۆ کارابوونی عەقڵ و بیر و ڕانانی هزریی، لەم پێناوەدا سەنتەر هەردوو سەرچاوەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی بەرز و بەڕێز بە بەکارهێنانی ئامرازی زانستە ئیسلامییەکان و زانستە کۆمەڵایەتی و سروشتییەکان دەکاتە بنەمای کارەکانی.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.

- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.

- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.

- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.

- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

**بوارەکانی کارکردن:**

- نووسین بە قەڵەمی خۆماڵی نووسەرانی کورد و بیرمەندان.

- وەرگێڕان لە زمانە جیاوازەکان بۆ زمانی کوردی لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کلتووری کوردی.

- بەستنی کۆڕ و سازدانی سیمینار لەلایەن خاوەن بیر و ئەکادیمیانەوە.

- خولی ڕاهێنان و ۆرکشۆپ لەلایەن کەسانی پسپۆڕ و خاوەن بڕوانامەی زانکۆییەوە.

- هاوکاریکردنی دامودەزگا و دامەزراوە ئەکادیمییەکان و زانکۆکان لە پێناو پەرەپێدانی ئاستی زانستی.